# سروه

ئه‌ده‌بی - فه‌رهه‌نگی

ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی ئینتشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی



٢٠

گۆواری ئەدەبی - فەرهەنگی سروە - ساڵی سێهەم - ژمارە ٢٠- ڕەشەمە ١٣٦٦- نرخ ١٥ تمەن

# مناجات

ئەی شاهی مەکە حاکمەکەی شاری مەدینە
ئەی رەحمەتی حەق گوڵشەنی گوڵزاری مەدینە

قوربانت ئەبم ئەی گوڵی گوڵزاری مەدینە
روحمێ بکە بەم حاڵەت و بەم قەلبە حەزینە

رۆژێ کە ببێ زیارەتی رەوزەت بەنسیبم
ئەی گرمە تەلا ئەم رووە بەو خاک و زەمینە

ئەم تۆزە لە رێ دا کە دەنیشێ لە وجوودم
دەرمانی غەم و مەرهەمی سەت گۆنە برینە

موحتاجە بە یەک زەڕڕە لە لوتف و کەرەمی تۆ
دەرمانی غەم و مەرهەمی سەت گۆنە برینە

بەو عەترە سەبا بۆ منی هێناوە بەسەوقات
لەو ساتەوە ئەم مەنزڵە وەک خولدی بەرینە

سەد مەرتەبە قوربانی غوباری قەدەمت بم
یەک لەحزە بەچاوی کەڕەم ئەم عەبدە ببینە

"قودسی" بووەتە خادیم و مادیح لە حزوورت
ئەی غەوسی سەقیلەین تەڵەبمکە لە مەدینە

" عەبدوڵڵا قودسی "

سەروتار ............ دەستەی نووسەران ............ ٣
میعراج .... عەبدولحەمیدحیرەت سەجادی ....... ٧
باسی ئەدەبی ........ د.عەزیزژیان(ئیسپانیا) ......... ١١
زێوەر ............ عومەرفارووقی(سەقز) .......... ١٦
بەیتی حەتەم ........ فۆلکلۆر .................... ١٩
کۆکە ............ خالەمین (نەغەدە) ............ ٢٣
بەیت چیە ............ ئەحمەدبەحری(مەهاباد) .......... ٢٦
دۆستی سروە ........ سەیدمحەممەدسەمەدی(مەهاباد) ..... ٢٩
عەینەڕۆم ............ مارف ئاغایی(شنۆ) ............ ٣٣
زانایانی کورد .... مەلاسەعیدئیبراهیمی(مەهاباد) ..... ٣٧
چارەرەشی ............ سمایل پیران(شنۆ) ............ ٣٩
راوەکەو ............ مستەفا مەحموودزادە ............ ٤٢
ژیان چیە ............ فاروق وەفایی(تاران) ............ ٤٥
حەسەن زیرەک ...... کەریمقەیوومی ............... ٤٩
جەدوەل ............ موهەندیس فاروق کەیخوسرەوی ...... ٥٢
شاعیرانی لاو ............................. ٥٥
شێرورێوی ............ رەسوول وەیسی(ورمی) ........ ٥٧
باکوروفە ............ پەرویز جهانی (ماکو) ........ ٦٣
ئێزدی ............ کافی رێبار (ورمێ) ............ ٦٧
سوورێژە ................................. ٧٠
فەرهەنگۆک ........ دەستەی نووسەران ............ ٧٤


## سەروتار

سلاو لە ئێوە ئەدیب و ئەدەبدۆست. سلاو لە ئێوەی هونەرمەند و هونەردۆست. سلاو لە ئێوە خەڵکی باش و بەشەڕەف کە بە دەربڕینی هەستی خۆشەویستی و ئەوین و پشتگری وها ودڵی عەزمی ئێمەتان جەزمتر کرد و بە ئەمەگ و قەدرزانی خۆتان سەبارەت بەم جوولانەوە مەزنە کە دێ لەسەر پێ راوەستێ و لە هەموو جێگەیەکی خاکی پاکی کوردستان جێی خۆی بکاتەوە و خۆشی و جوانی و گەشانەوە بەدیاری بێنێ پێشانتان دا کە بەڕاستی پالپشتێکی گەورەوپشتیوانێکی بەوەجن* بۆ بووژانەوە و ورە بەرزی.

نامە وولامی پڕ لە لوتفی ئێوەنە وا سانین* کە بە سپاسێک وەلام بدرێنەوە و نەوا سۆسرەتن* کە سەرمان لێیان سوڕ بمێنێ. وا باشترە بڵێین هەم سانین و هەم سۆسرەتن. بەڵێ وەختێک

بەجیا بڕوانینە ئەم بڕگەی زەمان ومێژوو ودەوری ئەو لە گووران وجەختە بوونی داهاتوویەکی روناک بۆکورد ( وەک هەموو خەڵکی دیکە ) نەبینین بەڕاستی ئەم پێشوازی یە سەیرە. بەڵام ئەو دەمە کە ئەم بڕگەی مێژوو بە بنەمای هەل و دەرفەتی رووناکتر و سازکردنەوەی سەرلەنوێی نیزامی بایەخی کۆمەڵایەتی چاو لێ بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە بە تاسەی دەروون وسروشتی پاکی هەرمانی خوازی یەوەیە هیچ سەیر و سەمەرەیەک نامێنێ. هەرچەند جێگەی ئەم باسە ئێرە نیە و بە کورتەدوان و دەرفەتی تەنگەبەر سەرناگرێ بەڵام دیسان لەباری تێگەیشتنەوە وەک پرسیارێک دێتە گۆڕ ووەڵامدانەوەشی بەجێیە. ئاخر ئێوە بڵێن ئێمە لە بەرامبەر ئەو هەموو لوتف و ئەوینەدا چ بکەین؟!.

**قسەیەک لەگەڵ ئێوە**

دۆستان! ئێستا ئەوە دوامین ژمارەی سروەی سێ ساڵەتان پێشکەش دەکەین تا لەم زستانە ساردەدا، تینی بنکەی پڕ ئەوین وخۆشەویستی بنەماڵان وهاودەم و هاوزمانی تەنیایان بێ.هیوادارین هەروەک زەردی خەزانتان هەڵبوارد زستانی تاڵی گیروگرفت ودەرد هەڵبوێرن. لەخودا دەپاڕێینەوە هەرچی زووتر بەهاری نەشەبەخش و هێمنەتی ژیان بۆ ئێمەوهەموو مرۆڤی ستەملێکراو وبێ بەش کە لە ژێر هەر چەشنە کۆڵەداری وحاکمەتی شەوەزەنگ دان و سارد و سۆڵی چەوسێنەری دونیا، گنجی لەنێو چاوان خستوون،دابین بکا.

برادەرینە :هەروەک بەهاری شیناوەرد وگەشی وحاکمەتی سەفا وبرایەتی لە کەژ و کۆ ولێڕو دەریا نزیک بۆتەوە، تا هەڵاتنی خۆری رووناکی ورزگاری و بەهاری ژیانی چەوساوە وزۆرلێکراوان لەپشت دەیجووری رەشی مێژووی حاکمەتی زاڵم و زۆردارانی سەربە رۆژهەڵات و رۆژاوا، هێندەی نەماوە!

**گوێ رادێرە:**

ئەری زڕەی پچڕانی زنجیری کۆیلەتی و ئەسیری بێ بەشان نابیسی؟ ئەرێ گرمەی تێک رمانی کاخی رەشی زوڵم ودەست درێژی کە خشتە خوێناوی یەکەی، لەشی نووزە لێبڕاوی مرۆڤی ستەم دیتووە نایەتە گوێت؟

ئەرێ نەهرەتەی دێوەزمەی نگریسی کۆڵەدار و لوورەی عیفریتی شەیتانی چەوسێنەرو ناڵە وکڕووزەی پیرەچەوسێنەر کە لەگەڵ زایەڵەی زەنگی سەرقافلەی نوور تێکەڵ بووە ناتلاوێنێتەوە؟

بەڵێ حاکمەتی بەکفر رەنگە سەر بگرێ بەڵام بە زوڵم نا!

**خۆشەویستان :**

بەم هیوایە کە لە

**بەم هیوایە کە لە داهاتوویەکی رووناکترو.... بتوانین وێڕای خەڵکی وڵاتانی دوور ونزیک پاڵ بە ئیمانی رزگاری دەر و یەکەتی زی خوا بدەین**

داهاتوویەکی رووناکتر و گرشەدارتردا بتوانین وێڕای خەڵکی وڵاتانی دوور و نزیک پاڵ بە ئیمانی رزگاری دەرو یەکەتی سازی خۆدا بدەین و لە گوڵزاری دڵبەندی وسوڵح و سەفا هەڵاڵەی سروود بچنین و لە کانیاوی رەحمەتی خواناوی خۆشەویستی و شەهدی ئەوین نۆش بکەین و لە ئاوی جاری " بەندەی موتلەق و دەربەستی خوا " هەڵبێین و لەهەر عەیب ودزێوی یەک پاک بینەوە، مەبەستێکی زۆر گرینگ وەبیر دەخەینەوە، ئەویش ئەوەیە کە بوونی دژایەتی لە هەموو ژیاندا هەروەک ناسین وزانین پێویستە، بۆ نیزامی بایەخداریش بەشێکی سەرەکیە وئەگەر دزێوی مانا نەداتەوە جوانیمان بۆ دەرناکەوێ.

**جوانی بێ عەیب چۆن هەست پێ دەکرێ ؟**

جا ئەم جیاوازیانە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و هەڵوێست گرتنی ژیاندا دەورێکی گرینگیان هەیە. خولقێنەری جیهان بەرنامەی وا داڕشتووە کە تەنگانە بۆ فەرعانە نیە جا شەرتی جێژوانی بەهاری جوان ودلڕفێن وگەشی ژیان هەڵبواردنی زستانی سارد و تووڕە وتۆسنی گێروگرفت و دەرد ونەخۆشی وکۆسپە. ئەم کۆسپ وبەڵاگەلەن کە مرۆڤ بۆ مەیدانی خەباتتا سەرکەوتن یاخۆ بەدەستەوەدانی زەلیلانە دەبەن.

ئێستا ئەوانەی بەئاواتی دیتنی بەهاری ئازادی و رزگارین دەبێ لەگەڵ سەرما و سۆڵی زستانی حاکمەتی چەوسێنەری ملانێ* وبەربەرەکانی بکەن، خۆ لە قەرەی کۆسپەکان بدەن، خۆڕاگر بن وبە دڵێکی کەلاوڕێزی هیوا و هومێد بە داهاتوو گەرم و رووناک، تۆفان هەڵایسێنن و هەورە رەشەی نەزانی وزوڵم و فریو لەبەرچاوی هەتاوی تین وشۆر وەلابەرن و لەشی شەکەت وبێ تینی مرۆڤی زۆر لێکرا و بژێننەوە.

بەڵێ ئێمەش دەبێ بڕۆین. بڕۆین تا لە مردن نەیەین. دەبێ بە لەز *وبەز بین کە بەهار نەوەستاوە. بەهار دەڕوا کاروانی نوور بەرە و جێژوانی گەورە بەخێرایی تێدەپەڕێ. مەنزڵ کۆبوونەوەیەکی زۆر گەورەیە. هەموو رەنگ وشکڵ و رەگەز و زمانێک تەنیا پێویستی بە فەرهەنگێک هەیە ....

نا ..نا فەرهەنگیشی ناوێ لەوێ دڵ یەکن. یەکیان دەوێ یەکێک دەبینن و بە هەموان یەکن.

نانا فەرهەنگیشی ناوێ ...
لەوێ دڵ یەکن
یەکێکیان دەوێ
یەکێک دەبینن
بەهەموان یەکن

خواتان لەگەڵ

"دەستەی نووسەرانی سروە"

سلام برشما ادیبان وادبدوستان سلام برشما هنرمندان وهنردوستان سلام برشما مردم خوب، مردم، خوب وشریفی که با اظهار صمیمیت ، دوستی، پشتیبانی وهمدلی عزممان را حزم‌تروبا قدرشناسی وارجگذاری به حرکت شکوهمندی که اکنون سروه تا با ایستادن برپایش وبازکردن جایش درنقطه نقطه ازخاک پاک کردستان طراوت ، جوانی و زیبائیش را بنمایش بگذارده نشان دادید که براستی پشتیبانی بزرگ و تکیه گاه محکمی برای تجدید نیرو و روحیه‌اید. نامه‌ها وپیامهای سراسر لطف شما نه عادی هستند که به یك تشکر بسنده کنیم ونه عجیبند که ازآن متعجب شویم. نه ! بهتراست بگوئیم هم عجیبند وهم عادی. آری وقتی که به این مقطع از تاریخ بطور انفصالی می‌نگریم و به تاثیر آن در جهت نقش و شکل دادن آینده‌ای روشن برای کرد ( مثل همهٔ انسانهای دیگر) نگاه نکنیم این استقبال عجیب می‌نماید. اما آنگاه که این مقطع را بنیان مقاطعی بمراتب درخشانتر وشالودهٔ ساختار نوینی از نظام ارزشی اجتماعی ببینیم درمی‌یابیم که این میل باطنی که با سرشت پاك و " جاودانه جوی" همرنگ است هیچ عجبی را همراه ندارد. هر چند که این بحث را جای دگر باید و پرداختی معیوب وعرصه‌ای محدودش نشاید، اما ازباب فهم تکلیف این پرسش را روا و انتظار پاسخش را بجا میدانیم وآن اینکه با لاخره در برابر اینهمه اظهارمحبت چه باید کرد ؟ .......

**سخن باشما**

دوستان! اکنون آخرین شماره از سروهٔ سه ساله را تقدیم نموده‌ایم تادراین زمستان سرد گرمابخش کانون پرمهر وعاطفه خانواده‌ها وهمدم و همزبان

تنهایان باشد.

امیدواریم چنانکه خزان را پشت سرنهادید، زمستان تلخ مشکلات ورنجها را نیز پشت سربگذارید. ازخدای خواهانیم تادربهار طراوت، در اعطای زیبایی و آرامش زندگی به شما وهمه بشریت مظلوم ومحرومی که در زیر یوغ استعمار و حاکمیت ظلمت بار، سرد و زمستانی استکبار جهانی شکن برروی دارند، تعجیل فرمایید.

دوستان عزیز! چنانکه بهار سبزی وخرمی وحاکمیت صفا وصمیمیت در دشت وکوه و جنگل ودریا نزدیك است تا طلوع صبح روشنی ورهایی وبهار زندگی مستضعفین ومظلومین ازپس یلدا شب تاریخ سیاه حکومت جباران وزورمداران شرق وغرب وقتی دیگر نمانده است!

**گوش بسپار!**

آیا صدای گستن زنجیر اسارت وبردگی محرومان رانمی شنوی؟

آیا صدای فروریختن کاخهای سیاه ظلم وتجاوز که خشت خونینش، پیکر نیمه جان بشریت ستمکشیده است بگوش نمیرسد؟

آیا نعرهء مرگ دیو پلید استعمار وزوزهء عفریت اهریمن استثمار ونالهء ذلت بارپیر استکبا-ر را که با آوای خوش چاوش کاروان نور درهم آمیخته، گوش جانت را نمی نوازند؟

آری که دوام ملك با کفر هر چند، اما باظلم هرگز!

عزیزان با این امید که در آیندهای بس روشنتر و درخشانتر بتوانیم همراه با مردم سرزمینهای دورونزدیك باتکیه براعتقاد رهائی ساز و وحدت بخش الهی، از گلزار صمیمیت و صلح وصفا، لالهء سرورچینیم واز چشمه سار رحمت خدا، زلال محبت، وشهد عشق نوشیم وتاتطهیر در جاری بندگی مطلق وانحصاری خالق سبحان "ازهر عیب وزشتی پاك گردیم، یك نکته بسیار مهم را یادآور میشویم وآن اینکه اصولا" وجود اضداد در کل حیات همچنانکه در شناخت ومعرفت امری ضروری است، برای نظام ارزشی رکنی اساسی محسوب میشود. آری اگر زشتی مفهومی نداشته باشد زیبایی چگونه درك میشود؟ وحسن بی قبح چگونه حس میگردد؟ این تفاوتها در عرصهء مسائل اجتماعی وجهت گیریهای مختلف زندگی نقش مهمی را ایفا میکنند. خالق هستی نیز بگونهای برنامهء خلقت را تنظیم کرده است که بی عسریسری حواله نکند و بدینسان شرط ملاقات بهار زیبا وجذاب وسرورآفرین زندگی طی زمستان سرد وخشن مشکلات

رنجها، دردها ومصیبتهاست. این مشکلات وبلاها هستند که

> **با این امید که درآیندهای بس روشنتر ودرخشانتر بتوانیم همراه با مردم سرزمینهای دورو نزدیک با تکیه براعتقاد رهائی سازو وحدت بخش الهی از گلزار صمیمیت وصلح وصفا، لالهء سرور چینیم، واز چشمه سار رحمت خدا، زلال محبت وشهد عشق نوشیم.**

آدمی رابه میدان مبارزه برای پیروزی ویاتسلیم ذلت بار میخوانند. اکنون آنانکه طالب وصال بهارآزادی ورهائیند باید با سرمای زمستان حاکمیت استکبار بستیزند، بامشکلات در آویزند، استقامت بخرج دهند وباقلبی سرشار ازامید به، آیندهای گرم و روشن، طوفانی بپا کنند وابرهای تیرهء جهل ستم وفریب را ازآستان خورشید گرمی وشور بزدایند و کالبد خسته وبی روح بشریت ستمکشیده را جانی دوباره بخشند.

آری ماهم باید برویم. برویم تامرده نمانیم. عجله باید کرد که بهار نایستادهاست. بهاردر حرکت است. قافلهء نور بسوی میعادی بزرگ شتابان است. اجتماعی بس بزرگ خواهد بود باهمه رنگها، شکلها، نژادها زبانها، آنجا فقط به یك فرهنگ لغت نیازاست .....

نه فرهنگ نیز نمیخواهد. آنجا دلها یکی است. آنها یکی میخواهند، آنجا یکی می بینند آنها یکی هستند........

عەبدولحەمید حیرەت سەجادی

کەعبە (بیت اللّە) بە مانای بەرزە ، جا ئەو بەرزیەش لەبەر ئەوەیە کە لە زەوی بەرزترە ویا لە حاست مەقام گەورەترە . "غیاث اللغات "

کەعبە چەند نێوی هەیە . وەکوو : قبلە (نصاب) بێنە ، ذات الورع ، بیت اللّە ، بیت الحرام ، بیت العتیق .

بەو هۆیە کە ماڵی بەیت چوار گۆشەیە پێی دەڵێن کەعبە . ولەتەفسیردا وەجهی تەسمیەی لەبەر چوارگۆشە بوونیەتی کە بەرامبەر بە "بیت المعور" لە ئاسمانە و ئەویش خۆی چوارگۆشەیە کە بەرانبەر بە عەرشە کە ئەویش هەر چوارگۆشەیە .

"تاریخ یعقوبی جلد ١، ل ٤١٧ و ٤٢٣ و تاریخ طبری و تاریخ الامم الملوک "

خوای گەورە دەفەرموێ:هەوەڵین ماڵێک کە بۆ ئینسان دانرا ،ئەو ماڵەموبارەکەیە لە مەکە، کە بۆتە هۆی هیدایەتی بەشەر . ودەوێشدا ئایاتێکی روون و مەقامی ئیبراهیم (د.خ) هەیە کە هەرکەس بچێتە ئەو مەقامە ئەمینە .

( قورئانی پیرۆز ، سوورەی آل عمران ئایەی ٩٦) .

دەگێڕنەوە کە خودای تەعالا پەری یەکی نارد بۆلای حەزرەتی ئادەم و سنوورو جێگەی ئەو ماڵەی نیشان دا .

کەعبە هەوەڵین خانوویە ـ کە کە لەسەر زەوی دامەزرا. "ابن عباس"دەڵێ حەزرەتی ئادەم هەوەڵ کەسێک بوو کە ئەو ماڵەی ساز کردو نوێژی تێدا کرد .

دەڵێن ئادەم (د.خ)نەقشەی "مسجدالحرام"ی لە رووی ، نیسێی هەورێک کە لەو جێگە دیار بوو کێشا .وئەونیسێ یە هەتا تەواو بوونی ستوونەکان درێژەی هەبوو . خودای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێ " وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ "

واتە : وەختێک کە ئێمە ماڵێ بەیت مان بەئیبراهیم نیشان دا . پێویستە بزانین کوڕانی ئادەم هەر لەوجێگە ستوونی ئەو ماڵەیان دانابوو .

دوای ئەوە حەزرەتی جبرەئیل ئەوی بردە "منێ" و نەقشەی مزگەوتی "منێ"ی کێشا . ئەوجار چوون بۆ عەرەفات وجبرەئیل پێی گوت لەوەختی خۆرئاوادا حەوت جار بە گوناهی خۆی ئیعتیراف بکا ، و هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەو مەکانە بە " عەرەفات " یا جێگەی ئیعتیراف ناسراوە .

دوای ئەوە گەیشتنە "جمع" ولەوێ نوێژی شێوان ونوێژی خەوتنانیان بە " جمع " کرد ودەستووری پێ درا هەتا بەیانی لەخاکی " جمع "دا بمێنێتەوە وبەیانی بچێتە سەرکێوی "مشعرالحرام"ولەوێ ددان بەتاوانی خۆیدا بێنێ ولە خودای خۆی بپارێتەوە .

وئێستا ئەنجامی ئەوکارە لەسەر ئەولادانی وی سوننەتە

دەڵێن وەختێک ئادەم (د.خ) ماڵێ بەیتی تەواو کرد وویستی حەج بکا ،گەیشتە

"منیٰ وعُرفه" وله‌گه‌ڕانه‌وه‌دا مه‌لایكه‌ ئه‌ویان له‌ "ابطع" دێ وپێیان گوت :ئه‌ی ئاده‌م زیاره‌ت قه‌بوول، به‌لام ئێمه‌ هه‌زار ساڵ له‌مه‌وبه‌ر مه‌راسمی حه‌جمان به‌جێ هێناوه‌ . (اخبار مكه ص ٧ — ١٠)

له‌ "مجاهد" ده‌گێڕنه‌وه‌ كه‌ له‌و وه‌خته‌وه‌ كه‌ ئاده‌م هاتۆته‌ سه‌ر زه‌وی كه‌عبه‌ بۆ هه‌موو ئۆمه‌ت و نه‌ته‌وه‌یه‌ك گرینگ وجێگه‌ی ڕێز بووه‌ . "نوح"یش (د.خ) پێش تۆفان ئه‌و جێگه‌ی زیاره‌ت كردووه‌ .

**مسجدالحرام :**

"مسجدالحرام"كه‌پازده‌جار له‌ قورئانی پیرۆزدا هاتووه‌ له‌ ده‌وری ماڵێ به‌یت دروست كراوه‌ وگه‌لێك خانووی تریش له‌ماڵێ به‌یت نزیك ببوونه‌وه‌ كه‌ حه‌زره‌تی عومه‌ر (رض) ئه‌و ماڵانه‌ی كڕی وكردی به‌حه‌ساری ماڵێ به‌یت .

حه‌زره‌تی عوسمانیش به‌نۆبه‌ی خۆی چه‌ند ماڵێكی بۆ ئه‌و مه‌نزووره‌ كڕی .

" ابن زبێر" به‌دانانی چه‌ند ستوون له‌به‌ردی مه‌ڕمه‌ڕ نومای ماڵێ به‌یتی جوانتر و ڕازاوه‌تر كرد.. "عبدالملك بن مروان" دیواره‌كانی بڵیند كرد "حجاج بن یوسف" به‌ ده‌ستووری وی به‌ په‌رده‌ی ئاوریشم ئه‌وێی ڕازانده‌وه‌

ده‌ڵێن هه‌وه‌ڵ كه‌سێك كه‌ ماڵێ به‌یتی به‌ په‌رده‌ داپۆشی "اسعدابوكرب حمیری" خه‌ڵكی یه‌مه‌ن بوو .

"ولیدبن عبدالملك"پلووسك وبه‌ری میچی كه‌عبه‌ی له‌ زێڕ دروست كرد .

كه‌سانی تریش وه‌كوو : منصور ،مهدی،هادی، معتضد ، معتمد ، له‌خه‌لیفه‌كانی عه‌بباسی ،و"سیف الدین ظاهری" و "ملك اشرف قبا تبای" ( نێودارترین سه‌لاتینی برجی) وبه‌تایبه‌ت سه‌لاتینی عوسمانی هه‌ركام له‌ وه‌ختی خۆیاندا بۆ باشتر ڕازاندنه‌وه‌ی "مسجدالحرام" تێكۆشاون .

سعوودی یه‌كان له‌ ساڵی ١٣٧٥ هـ .ق نێزیكه‌ی ٨٠٠ میلیۆن ریاڵی سعوودییان له‌ ئاوه‌دانی و ته‌عمیراتی "مسجدالحرام" خه‌رج كرد ، و ئێستا پێوانه‌ی "**مسجدالحرام**" له‌ ٢٧ هه‌زار میتری موڕه‌به‌ع گه‌یشتۆته‌ ١٨٠ هه‌زارمێتری موڕه‌به‌ع . و ئه‌و خانووه‌ مه‌باره‌كه‌ ٦٢ ده‌ركی گچكه‌ و مه‌زنی هه‌یه‌ كه‌ نێوی سێ ده‌رگای له‌ هه‌موان گه‌وره‌تره‌ بریتین له‌ : باب الملك عبدالعزیز — باب العمرة باب السلام . هه‌ركام له‌وسێ ده‌رگایانه‌ دوو مناره‌ی بڵیندیان له‌سه‌ره‌ كه‌به‌رزایی یان ده‌گاته‌ ٩٢ گه‌ز و پایه‌كه‌شی (٧ گه‌ز × ٧ گه‌ز)ه‌ و له‌سه‌ر هه‌رمناره‌ هیلالێك به‌ به‌رزایی ٥/٦ هه‌یه‌ كه‌ به‌ زێڕی خالیس ڕوكێش كراوه‌ حه‌وته‌مین مناره‌ له‌سه‌ر "باب الصفا"یه‌ كه‌ له‌ ته‌نیشت وی گومبه‌زێك به‌ قوتری ٣٥ گه‌ز و له‌سه‌ر ئه‌و گومبه‌زه‌ش هیلالێك له‌ڕوكه‌شی زێڕی دانراوه‌ .

له‌ ئاكامی ئه‌و ئاڵ و گۆڕه‌ "مسجدالحرام" ئێستا جێگه‌ی ٥٠٠ هه‌زار نوێژكه‌ر ده‌بێ . (گۆڤاری ده‌وڵه‌تی **عه‌ڕەبستانی** سعوودی ساڵی ١٣٩٨ مانگی )

**مسجدالاقصی :**

"مسجدالاقصی" دووهه‌مین مزگه‌وتی سه‌ر زه‌وییه‌ كه‌ چل ساڵ دوای "مسجدالحرام" دروست كراوه‌ . حه‌زره‌تی داوود (د.خ) ساز كردنی ئه‌و مزگه‌وته‌ی ده‌ست پێكرد و حه‌زره‌تی سوله‌یمان (د.خ) ئه‌وێی بۆ عیباده‌ت ته‌واو كرد .ئه‌و مزگه‌وته‌ به‌درێژایی مێژوو چه‌ندجار رووخاوه‌ و دروست كراوه‌ته‌وه‌ . بۆ وێنه‌ له‌ زه‌مانی "عبدالملك بن مروان )

ماوه‌یه‌ك ئه‌م مزگه‌وته‌ رووگه‌ی موسوڵمانان بوو، له‌ پاشان رووگه‌ بۆلای كه‌عبه‌ گۆڕا .

"مسجدالاقصی" كه‌ له‌ مزگه‌وتی عومه‌ر (د.خ) كۆنتره‌ كلیسایه‌ك بووه‌ كه‌ "ژۆستی نین" ئیمپڕاتووری ڕۆم به‌ نێوی حه‌زره‌تی **مریه‌م**ی دروست كردووه‌ و حه‌زره‌تی عومه‌ر ئه‌وێی تێك دا و كردی به‌ مزگه‌وت .

ئەو مەعبەدە جارێک لە ساڵی ٥٨٥ زایینی بوولەرزە، تێکی دا ودیسان لەنوێ دروستکراوە. دەتوانین بڵێین هەتا بەجۆرەی مزگەوتی ئەورۆی لێ هاتووە، ئاڵ وگۆرێکی زۆری بەسەرداهاتووە لەساڵی ٥٨٣ مانگی"صلاح الدین ایوبی" لەسەرڕا سازی کردەوە، ولە سەدەی نۆهەمی کۆچی دا بەشێکی تری لێ زیاد کرا. (تلخیص له تمدن اسلام وعرب).

ئایەی "اسراء" لە جێگەیەک نازل بوو کەئێستا لەبەینی دیوارەکانی حەرەمی شەریف لە قودسە و خودای گەورە ئەو مەکانەی بۆ عیبادەتی عەبدانی خۆی دانا. لە ئایەتەکەدا تەنیا نێوی مزگەوتەکە هاتووە و باسی عیمارەتی "مسجدالاقصی" ومزگەوتی "صخره" یا عیمارەتەکانی تر نەکراوە.

خەلیفەی دووەم وەختێک لە ساڵی ١٥ ی کۆچی قودسی گرت وهاتە وێ لە "کعب الاخبار"ی پرسی: جێگەی مزگەوتکو ێیە؟ کەعب گوتی: ئەوی لە پشتی "صخره" دروست بکە. حەزرەتی عومەر (د.خ) گوتی ئەی کەعب تۆ ئەوت بەرانبەر بەیەهوود دانا. هەر لەو جێگەیەی دادەنێن کە ئەورۆ بەمزگەوتی عومەر ناسراوە. دوای ئەوە بە شاقەڵی عەبایەکەی خۆڵی لە "صخرە" کەهەڵدەگرت و دەیهێنا ئەو جێگایە. موسوڵمانانیش لەو کارەدا یاریدەیان دەدا.

"عبدالملک بن مروان"دوو مزگەوتی بەنێوی "مسجد الاقصی" و "مسجدصخره"دروست کرد وئەورۆ "مسجدالاقصی" بە تەواوی ئەو بەشانە دەڵێن کە حەسار وبورج و بارووی تێدایە. وەهەمان مەکانێکە کە وەختی "اسراء" و"معراج" مەشهوور بووە.

(کتێبی بیت المقدس لەئیسلام تالیفی ئەحمەد مەحموود وەرگێڕاوی عەلی منتظمی)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ
سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ. (سوورەی اسری ئایەی ١)

واتە: پاکی و مونەزەهی شیاوی ئەو کەسەیە کە بەشەو عەبدی خۆی لە "مسجدالحرام" را بردە "مسجدالاقصی"، مزگەوتێک کە دەوراندەوری ویمان بەرەکەت دا تا ئایاتی خۆمانی نیشان بدەین، بێ گومان ئەو دەبیسێ ودەبینێ.

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ
وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى. وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى، ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى. وَهُوَ بِالأُفُقِ الأَعْلَى ثُمَّ دَنَى فَتَدَلَّى، فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى، أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى. عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى، مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى.
(سوورەی نجم، ئایەی ١ تا ١٨).

واتە: سوێند بەئەستێرە وەختێک دێتەخوارەوە، خاوەنی ئێوە (محمد) ڕێگەی ون نەکردووە و ڕێگەی خواری نەگرتووە، وبەهەوای نەفس قسەی نەکردووە، (ئەو قورئانە).

لە غەیری وەحی خودا شتێکی تر نیە. جبرەئیل هەمان فرشتەی توانا عیلمی فێر کرد. هەمان مەلیکی توانا بە خلقەتی کامیل بەرەسووڵی نواند، پێغەمبەرێک کە لە بەرزترین ئاسۆی کەماڵدا بوو. لە پێغەمبەر نیزیک و نیزیکتر بووە، بە مەودای دووکەوان یا نزیکتر، جا وەحی بۆ عەبدی خودا هێنا ئەو شتەی کە وەحی پێکرابوو، ئەو شتەی کە دیتی بەبێ وەهم و خیاڵ بەراستی زانی. ئایا ئەو شتەی پێغەمبەر لەشەوی مێعراجدا دیتی (کافران) ئینکاری دەکەن. بێ گومان جارێکی تریش (محمد) ئەوی

(جبرەئیل) دی ، نیزیک "سدرەالمنتهی" کە نیزیکی ئەو بەهەشتە (جیگەی پاکان ) و کاتیک "سدرە"ی داپۆشی کە ئەحەدیک ئاگای لێ نیە چاوی وی (محمد)ئەو حەقیقەـتە کە دەبوو بێ بینێ بێ کەم وزیاد دیتی. بێ گومان لەو شوینە بەشێک لە گەورەترین ئایاتی ئیلاهی دی .

**إنّه لقول رسول كريم، ذي قوّة عند ذي العرش مطاع ثمّ أمين . وما صاحبكم بمجنون ولقدرآه بالأفق المبين .**

( سوورەی تکویر، ئایەی ۱۹ تا ۲۳) .

واتە: بەراستی ئەوە وتارەی رەسوولی خاوەن کەرەمی خوایە. توانا ومەقام پێدرا و لەلایەن خاوەن عەرش فەرمانرەوای مەلائیک و ئەمانەتدارە . یاری ئێوە شێت نیە (ئەو) جبرەئیلی لە ئاسۆی روون دی .

**"وتارێک لەبارەی میعراج کە لەشی کرنەوە و کتێبی باوەرپێکراوی ئیلاهیدا هاتوون":**

هێندێک پێیان وایە کە مێعراج دەخەودا بووە نە بێداری، ئەو رایەش بە پێچەوانەی ئەخباری دروستە .

راستئەوەیە کە حەزرەت بە وشیاری و بێداری چۆتە مێعراج ، بە شەو لە "مسجد الحرام" بۆ "مسجدالاقصی" ولە ( مسجدالاقصی" بۆ ئاسمانی دنیا ولە ئاسمانی دنیا بۆ "سدرەالمنتهی" تا ئەو جێگە کە خودای تەعالا فەرمووی : **فكان قاب قوسين أو أدنى .**"

وئەگەر میعراج بە خەو با نەدەبوو بەموعجیزە بۆ پێغەمبەر (ص)،ونە دەلیلێکی روون دەبوو بۆ کافران ، چون لە خەودا زۆر کەس شتی وەکوو قیامەتوزیندوو بوونەوە، وبەهەشتو ...... دەبینن . هەرچەند لە لایەکی ترەوە کافران دەیانگوت لە مەکە بۆ " بیتالمقدس" چوون و گەرانەوە چل رۆژان دەخاـیێنێ، چۆن ئەو دەڵێ بە شەوێک چووم و گەرامەوە و ئەگەر گوتبای ئەو سەفەرەم، بە خەون دیتووە ئینکاریان نەدەکرد، دەلیلێکی دیکە ئەوەیە کە خودای تەعالا ئیشارە بە قودرەتی خوی دەکا کە عەبدی خوی لە مەکەوە بردە "بیتالمقدس" ( کورتکراوە لەکشفالاسرار)

میعراج بە مانای پلەکانە و لە قورئاندا لە سوورەی ۸۱ ئایەی ۱۹ تا ۲۵ وسوورەی ۵۳ ئایەی ۱ تا ۱۲ باسی ناردراوێکی ئاسمانی بۆ لای«محمّد»،دەکا و لە رووداوێکی ئاسمانی دەدوێ کە لە دوور بۆ لای دێت بەبێ ئەوە گوتبێتی کە خۆی سعوودی کردووە بۆ ئاسمان . تەنیا لە سوورەی ۱۷ ئایەی یەک ئیشارەی بەوە کردووە .

تەواوی عولەمای ئیسلام رایان لەسەر ئەوەیە کە مەنزوورلەعەبدی خۆی هەمان محەممەدە و مەنزوور لە «مسجدالحرام» هەمان کەعبەی موسولمانان لە مەکەیە ، و "مسجدالاقصی" مزگەوتێکە کە ئێستا لە "بیتالمقدّس"ە .

هێندێک گوتوویانە مەنزووری "محەممەد"(ص)لە " مسجدالاقصی" دوورترین نوختەی ئاسمان بووە کە لە بەرزترین لایەکانی ئاسمان هەڵکەوتووە و جێگەی ئەو مەلایکانەیە کە خەریکی زیکری خودان (دائرةالمعارف اسلامی)

هێندێک دەڵێن پێغەمبەر (د.خ) ئەوەی بەخەون دیت . هێندێکیش دەڵێن خەوالوو بووە ( بەینی خەووبێداری ) وهێندێکی تر دەڵێن بەتەواوی بێدار و وشیار بووە .

میعراج لێرەرا دەست پێدەکرێ کە پێغەمبەر ( ص ) لە "مسجدالحرام"دابوو . کاتێک لە شەو تێپەر بوو کە جبرەئیل (د.خ) بە بوراقەوە دێتە بەر دەرگای مزگەوت و بانگی پێغەمبەر دەکا

پێغەمبەر (ص)دەنگی جبرەئیل دەناسێ ودێتەدەر. دەبینێ

**بروانە لاپەرەی ۶۱**

# باسی ئەدەبی

ژیان بۆ وچان لە ئاڵ و گۆڕ دایە و ئادەمیزاد بێ پشوودان بەرەوپێش خۆ دەکوتێ. لە سایەی پێشکەوتنی تێکنۆلۆژییەوە مرۆڤ بەرەوناخی فەزا تێکشاوە و هەنگاوی ناوەتە سەر کورەی مانگ .ئەو پێشکەوتنە بە هۆی ئەو هەموو ئیختیراعەوە کە سات بە سات پێشکەشی کۆمەڵگای ئینسان دەکرێ،ئاهەنگی بە تەوژم و بەهێزتر و رۆژ لە رۆژێ هەنگاوی خۆشتر دەبێ لەنێو هەموو هۆیەکانی ئەم پێشکەوتنەدا،

بێگومان زمان گرینگترین هۆیە. بۆیە سەوت* گەیاندنی ئەم قسە ئەوەندە بەسە کە وای دانێین بەشەر زمانی نەبوایە؟ ئەودەم ئاخۆ ژیان چۆن دەبوو ؟!

زمان چیە ؟

**زمان پێش هەموو شتێک یانی پێوەندی بە هۆی دەنگەوە و لەسەریەک بەو بەشە لە رەفتاری ئادەمیزاد دەگوترێ کەلە چوارچێوەی تێگەیشتن و تێگەیاندندا لە دەنگ کەلک وەردەگرێ .زبان دەبێتە هۆی جیاوازی ئینسان و جانەوەر. هەر بەو هۆیەشەوە گوتوویانە :**

**" ئینسان جانەوەرێکە کە دەتوانێ قسە بکا .**

من ئەو رستەیەی ئاوا تەواو دەکەم کە ئینسان جانەوەرێکە کە دەتوانێ قسە بکا و بیر بکاتەوە." ئەو وتەیە بەتەواوی دروستەو قسەی تێ ناچێ . چونکە زمان بۆخۆی بەتەنیایی دیاردەیەکی* سەربەخۆ نیە . پێش ئاخاوتن هەمیشە بیرکردنەوە دەگۆڕی دایەوهەردووکیان وێکڕا وەکار دەکەون تا پێوەندی بەرقەراربێ بیرکردنەوە خۆی تێکەڵاوێکە لە هەست و بیرەوەری و لێکدانەوە . وەختێک دەنگێک دەبیسین تەواوی ئەم هێزانە بۆ ناسین و دۆزینەوەی مانای ئەو دەنگە پێکەوە دەست بەکار دەبن .بۆ شی کردنەوەی ئەم ڕەوەندە پرسیارێک دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە ."**سێو چیە؟** سێو ! بۆ وڵامدانەوە نیازمان بە بیرکردنەوە، لێکدانەوە ولێک جیاکردنەوە هەیە .

**١- هێزی بیرکردنەوە تایبەتی یەکانی سێومان وەبیر دێنێتەوە .**

**٢- لێکدانەوە پێمان دەڵێ سێو چیە .**

**٣- لێک جیاکردنەوەش یارمەتیمان دەدا سێو لە شتی دیکە جیا بکەینەوە .**

کاتێک ئەم هێزانە کاری خۆیان کرد دەتوانین وڵامی پرسیارەکە بدەینەوە.بەمجۆرە روون دەبێتەوە کە زبان سیستمێکی زۆرتێکەوە پێچراوە وگرینگترین بەهرەیەکە دراوە بە ئینسان .

**بەسەرهاتی زمان**

هێندێک زمان ناسلایان وایەکەس **نازانێ ئادەمیزاد کەنگێ و لە کوێ قسەکردنی دەست پێکردووە** . بە بڕوای جەماوەرێک لە زانایان **سەرچاوەی قسەکردن دەگەڕێتەوە ئەوزەمانەی کەئینسان توانیویەتی بە دەست و باقی ئەندامەکانی حاڵەتی تایبەتی بگرێ و بیەوێ شتێکی رابگەیەنێ** . هەرچۆنێک بووبێ،ئاشکرایە کە ئەم رووداوە گرینگە شتێکی تەسادوفی نەبووە و زمان تا گەیوەتە ئەمرۆ بەزۆر بار و دۆخی تایبەتیدا تێپەڕیوە وگەشەی کردووە . هەل ومەرجی **کۆمەڵایەتی - جوغرافیایی و کۆمەڵایەتی - ئابووری** ئاڵ وگۆڕی بنەرەتی لە رەوەندی تەکامولی زماندا پێک هێناوە .ئەم وشانەی ئەمرۆ هەمانە لە کۆنەوە هەر ئاوا نەبوون .ژیان وڕابردووی تاڵیان بەسەردا

تێپەڕیوە . لە درێژایی ژیاندا تێک شکاون ، سواون ، گۆڕاون وجاری وایەوەها گۆڕاون کە بەجارێک لەناو چوون و فەرامۆش کراون .

**شەڕوکۆچ وپێوەندی بازرگانی و فەرهەنگی زۆریان کار کردۆتە سەر زبانەکان .**

زبان ناسی پسپۆر دەزانێ کە لەگەڵ پەل هاویشتن و بنەگربوونی ئیمپەڕاتۆری یەکاندا زبانێکی گشتی بە شێوەیەکی ڕەسمی دەکار کراوە . لەسەر ئەوەش ڕا لەهجە ناوچەیی یەکان درێژەیان بە ژیان داوە و هێندێکیان وردە وردە بوونە زبانێکی تەواو تەڕو پاراو . ئەمرۆ نزیکەی ٢٠٠٠زبان و سەتان لەهجە لە سەرانسەری دنیادا هەن .

بۆ ریشە وبنچینەی زمانەکان زمان ناسی قەرنی نۆزدە بەهەڵکەوت تووشی خزمایەتی و وێکچوونێکی زۆر لەنێوان زمانە ئورووپایی و ئاسیایی یەکاندا بوون . ئەم رووداوە بووبە هۆیەک کە سەرگوزیشتەی زمانەکان تا بنەبانی مێژوو بکەوێتە ژێر باس ولێکۆڵینەوەونەخشەی زمانە هێندو ئورووپایی یەکان بکێشرێتەوە .

بەڵام بێجگە لەوانە زمانگەلێکی دیکەش لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقا و ئەمریکا ی جەنووبیدا هەن کە لەو نەخشەدادیاری نەکراون.

**باوەری جۆراوجۆر لەسەر پەرەسەندنی وتار**

بیروڕای زمان ناسانی کۆمەڵناس دەکرێتە چوار بەش کە بریتین لە :

١- **فەرزیەی تەقلید :** بەپێی ئەم بیروڕایە وتار یا قسەکردن بەمجۆرە پەیدا بووە کە ئینسان لاسای دەنگی جانەوەرودەنگی شتی دیکە کە لە سروشتدا هەن کردۆتەوە وبەرە ، بەرە زمان پەیدا بووە . وەک دەنگی سەگ ومەل وچۆم و تافگە و شتی دیکە .

**٢- فەرزیەی ڕیتم و ئاهەنگ**

بەپێی ئەم بیروڕایە ئادەمیزاد هەر لە سەرەتاوە خاوەنی دەنگی بە ئاهەنگ بووەوبەو دەنگەوە پێوەندی لەگەڵ دنیادا کە ئەویش خاوەنی ئاهەنگ وڕیتمە ، گرتووە . ئەو دەنگە بەئاهەنگە سەرچاوەی زمان وقسەکردنە کە لە درێژایی مێژوودا گەشەی کردووە و دابەش دابەش بووە :

**٣- فەرزیەی هەست وئیحساس :**

ئەم بیروڕایە هەرچەشنە وتە و قسە و دەنگێک دەداتە پاڵ ئێش وئۆف وترس وشادی و سەرسوڕمان و شتی دیکە .

تەنانەت ئەمرۆش بۆ هەریەک لەو حاڵەتە عاتیفی یانە (ترس ،شادی و....) دەنگێکی تایبەتی هەیە کە بەپێی ئەم بیروڕایە سەرچاوەی هەموو چەشنە وتارێکە .

**٤- فەرزیەی جووڵانەوە وبزووتنەوە :**

بەپێی ئەم بیروڕایە ، یەکەمجار ئادەمیزاد بە ئیشارە و جووڵاندنەوەی سەر و دەست پێوەندی یان بەیەکەوە گرتووە . ئەم زمانە سروشتی وزاتی بووە وئێمەش ئەمرۆ کاتێک بانگی کەسێک دەکەین یا دەمانەوێ لەگەڵ کەسێک کە زمانی نازانین قسە بکەین لەزمانی ئیشارە ودەست وپەل هەڵتەکاندن کەڵک وەردەگرین .بەپێی ئەم فەرزیە تەکان وجووڵەی دەست هەمیشە لەگەڵ بزاوتنی زمان و شەویلکە هاورێ بووە وبە مرووری زەمان دەنگی زار و زمان جێگەی جووڵانەوە وبزووتنەوەی دەستی گرتۆتەوە و **بەمجۆرە لە "زمانی عەلامەت و ئیشارە"ڕا** گەیشتوونە "زمانی دەنگ وقسەکردن"

**سەرهەڵدانی خەت**

ئینسانی سەرەتایی کە لە ٤٥٠٠٠ ساڵی پێش لەدایک بوونی عیسا لەسەر زەوی ژیاوە، فکرو بیروڕای خۆی لەسەر تاشە بەرد و دیواری ئەشکەوتاندا دەکێشاوە (شکل کێشان) ئەمڕۆ نەخشی گاو ئەسپی سەردەمی سەهۆڵبەندان لە ئەشکەوتەکانی **ئاڵتامیرا** و ئەسپانیا ولیسکۆی فەرانسەدا هەرماون وپاش دەست کردن بەوشکڵ کێشانە بوو کە سەرئەنجام نووسین لە ماوەی چەند هەزار ساڵ ڕەواجی پەیدا کرد و پوختە بوو.

لە ماوەی ٢٠ هەزار تا ٦٥٠٠ ساڵی پێش لەدایک بوونی عیسا نووسین تەنیا بریتی بوو لەو نەخش وعەلامەتانەی کە ئینسان لەسەربەرد و ئێسک هەڵیدەکەندن. هەر لەم ناوەدابووکە ئەم نەخش ونیگارانە بوونە عەلامەتی دەنگ و هەرکامەی فکرو ئیدەیەکی مانا دەکردەوە (فکر نووسین).

شکڵی (٢) نیشان دەدا چلۆن عەلامەتەکان کە هەریەکەی لەسەرەتادا شکڵی شتێک بوون گۆڕدران و بوونە نیشانە وعەلامەتی تایبەتی.

یەکەم زمان کەنووسراوەتەوە **زمانی سۆمێری** بوو. هەرچەند ئەلف بێتکەشی نەبوو. بۆ نووسینی ئەم زمانە کەلە ٣٥٠٠ی پێش میلاددا ڕەواجی بوو بە شکڵی سادە دەکار دەکرا وهەر شکڵەی ئەفسانە ونەزیلە وباسێکی میعماری یا ڕیازی نیشان دەدا. وڵاتی سۆمێر بەشێکی چکۆڵەی بەینونەهرێن بوو کە دەکەوێتە سەر خلیجی فارسی ئێستا. نموونەیەک لە نووسراوەی سۆمێری لە عێراقدا دۆزراوەتەوە. نیشانەو شکڵ گەلێک کە لەسەر قوڕ کێشراونەوە نیشان دەدا.

لە وڵاتی میسریش "خەتی شکڵی" بە ناوی **هێروگلێف** دەکار دەکرا. لەم خەتەدا هەر نیشانەیەک پێشاندەری واژەیەک، دەنگێک یا بڕگەیەک بوو. زەمانی دەکارکردنی ئەم چەشنە نووسینە دەگەڕێتەوە ٣٠٠٠ ساڵی پێش میلاد کە ٣٠٠٠ سال بەبێ هیچ ئاڵ وگۆڕێک هەر مایەوەو زۆرتر بۆ نووسینی بابەتی پیرۆزی ئایینی و ڕازاندنەوەی ساختومانە مێژوویی یەکان کەلکی لێ وەردەگیرا.

لە چینیش پاشماوەی خەتی چینی لەسەر

PROTO-INDO-EUROPEAN

BALTIC: Old Prussian, Lithuanian, Latvian
BALTO-SLAVIC
SLAVIC
WEST SLAVIC: Wendish, Polish, Slovak, Czech
EAST SLAVIC: Russian, Ukrainian, Byelorussian
SOUTH SLAVIC: Slovene, Serbo-Croatian, Macedonian, Bulgarian, Old Church Slavonic
GERMANIC
NORTH GERMANIC: Old Norse — Icelandic — Old Icelandic, Faroese, Norwegian — Middle Norwegian — Old Norwegian, Swedish — Middle Swedish — Old Swedish, Danish — Middle Danish — Old Danish
WEST GERMANIC: English — Middle English — Old English, Frisian — Old Frisian, Dutch — Middle Dutch — Old Dutch, Flemish, Afrikaans, Old Low German — Middle Low German — Low German, Old High German — Middle High German — (High) German, Yiddish
EAST GERMANIC: Gothic
CELTIC
GOIDELIC: Irish Gaelic, Scottish Gaelic, Manx
BRYTHONIC: Welsh, Cornish, Breton, Gaulish
ITALIC
OSCO-UMBRIAN: Oscan, Umbrian
LATINO-FALISCAN: Faliscan, Latin
Latin: Portuguese, Spanish, Catalan, Provençal, French, Italian, Rhaeto-Romance, Rumanian
Illyrian, Albanian, Thracian
HELLENIC: Greek
Armenian, Phrygian
ANATOLIAN: Hittite, Luvian, Lydian, Lycian
TOCHARIAN: Tocharian A, Tocharian B
INDO-IRANIAN
DARDIC: Dard
INDIC: Sanskrit — Sindhi, Romany, Urdu, Hindi, Bihari, Assamese, Bengali, Marathi, Gujarati, Punjabi, Singhalese
IRANIAN: Pashto, Baluchi, Kurdish, Sogdian, Avestan, Old Persian — Middle Persian — Persian, Pahlavi

(3)

**The Indo-European Family of Languages,** of which English is a member, is descended from a prehistoric language, Proto-Indo-European, spoken in a region that has not yet been identified, possibly in the fifth millennium B.C. The chart shows the principal languages of the family, arranged in a diagrammatic form that displays their genetic relationships and loosely suggests their geographic distribution. The European groups are shown in somewhat fuller detail than the Asian ones, and in the Germanic group, to which English belongs, the intermediate historical phases of the languages are also shown. This Dictionary contains an Appendix listing all of the Indo-European roots underlying English words, beginning on page 1496. Two articles by Professor Calvert Watkins discuss the nature and significance of Indo-European: an introductory article, beginning on page XIX, and a descriptive exposition at the beginning of the Appendix. There is a chart of the principal Indo-European sound correspondences opposite this page.

ئێسک وقاپێلکە کیسەڵان لە دەرەی چۆمی زەرددا کە تەمەنیان دەگاتە ١٥٠٠ ساڵ دۆزراوەتەوە.

زۆربەی ئەم عەلامەتە سەرەتاییانە شکڵ گەلێک بوون کە ناسینەوەیان زۆر ئاسان بوو. مەسەلەن بۆ رۆژ جەغزێکیان دەکێشاوە کە خەتێکی تێدا بوو. بۆ مانگیش شکڵێکی وەک دمەداسیان دەکار دەهێنا.

چەند نووسراوە لە قەبرێکدا لە فنیقیە دۆزراونەوە کە دەگەڕێتەوە ساڵی ١١٠٠ی پێش میلاد. لەم نووسراوانەدا ٢٢ پیت دەکار کراوە و هەر پیتەی پێشاندەری شتێکی بەکەڵکە کەلە ژیانی خەڵکی ئەو سەردەمەدا کەڵکی لێ وەرگیراوە .مەسەلەن پیتی A لە فنیقیەی قەدیمدا ئەلف یان پێدەگوت کەبە مانای

| Pictograms 3500 BC upright | Pictograms 3100 BC turned to left | Pictograms 2800 BC | Sumerian 2400 BC Linear | Sumerian 2400 BC Cuneiform | Babylonian 1700 BC | Assyrian 700 BC | Meaning |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | head/front |
| | | | | | | | bird |

"گا" بوو. لە سەرەتاوە ئەلف شکڵێکی ئەو جۆرە (⟨) بوو کە پێشاندەری شاخی گایە . پاشان یونانی ئەو شکڵەیان وەرگرت سەرو بنیان کرد وپیتی "A" کە ئەمرۆ ئێمەش- دەکاری دێنین وەبرەو کەوت. هەرپیتەی کە ئەمرۆ لە ئەلف و بێتکەدا هەیەسەرگوریشتە- یەکی تایبەتی خۆی هەیە. کە لە دیاگڕامی (٤) دا چەند نموونەیەک دەخەینە بەرچاو:

ئەم باوەڕە زۆر پتەوە کەئەلف وبێ بەهۆی پێوەندی بازرگانی لەهەزار ساڵ پێش میلادەوە، گەیشتە یۆنان ودو شێوەی لێ کەوتەوە .نێزیک بە ساڵی ٤٠٠ی میلاد ئەلف بێتکەی ئیۆنیک کە لە رۆژهەڵاتی یۆناندا پەرەی گرتبوو لە شاری ئاتێن وەرگیرا کە ٢٤ پیتی هەبوو. هەر ئەم ئەلف بێتکەیە بوو کەلە پاشان بوو بە ئەلف

**ئەلف بێتکە**

یەکەم جار ئەلف وبێ لە بەینونەهرەین (عێراقی ئەمرۆ) ئیختراع کرا. لە ساڵی ١٣٠٠ی پێش میلاد لە بەندەری بازرگانی ئۆگارێت (رەئس شەمرەی ئەمرۆ) لە سنووری دەریای سووریادا یەکەم ئەلف وبێی ڕاستی ، هاتەدی وپەرەی گرت ، لەم ئەلف وبێیەدا هەر پیتەی عەلامەتی دەنگێک بوو وبەپێکەوەلکانی پیتەکان واژەیان دادەڕشت.

ئەو سواڵەتە گڵینانە کە لە ئۆگارێت بیندراونەوە کاملترین ئەلف بێتکەیان لەسەر نووسراوەتەوە کە لە ٣٢ پیت پێک هاتوون.ئەم ئەلف وبێیە پاش هێندێک ئاڵ وگۆڕ و دەست تێوەردان لە لایەن گەلەکانی هاوسێ وەک عیبری و موبیتەکان وەرگیرا ودەکار هێنرا.

بێتکەی کلاسیکی یۆنان .

لە رۆژاوای یۆناندا ئەلف بێتکەیەکی دیکە برەوی پەیدا کرد کە لە لایەن ئەتروسکەنەکانەوە لە ئیتالیدا وەرگیرا و بوو بە بنەمای ئەلف بێتکەی **لاتین** .

**گرینگی ئەلف بێتکە**

پێش ئیختیراعی ئەلف وبێ ورەواجی نووسین ئەزموون وزانستی ئینسان تەنیا لە رێگەی بیرەوەری یەوە لە بەرەیەکەوە دەگەیشتە بەرەی دوایی . زۆربەی ئەم زانست وئەزموونە بەنرخانە بەمردنی خاوەنەکەیان لەناو دەچوون و نەدەمان .

بە پەرەگرتنی نووسین زانست وئاگاداری ئینسان لەسەر بەرد و چێوو چەرم وئاسن ومس و سەرئەنجام لەسەر کاغەزیش وێنەگەری کرا و نووسرانەوە وبەم شێوەیە لە مەترسی تێداچوون رزگاریان هات .

پەرەگرتنی زمان ونووسین ئاڵ و گۆڕێکی گەورەیە لە شارستانەتی بەرەی ئادەمیزاددا . شێوەی پێوەندی ئینسان ئاڵ وگۆڕی گەورەی بەسەر داهات و"**دەورەی پێوەندی دەنگ**"بوو بە "**دەورەی پێوەندی نووسین**" لێکدانەوەی ژێروو جیاوازی یەکانی نێوان ئەم دوو دەورەیەمان بۆ روون دەکاتەوە .

لە"دەورەی پێوەندی دەنگ"دا پێوەندی ئینسان لەگەڵ ئینسان بەبیستن وگوتن بوو .بۆ ئەم مەبەستەش دەبوایە ئینسانەکان لەتەنیشت یەک وبەرامبەر بەیەک بن.لەم پێوەندی یەدا واژە وقسە ورستە لەزاری وێژەرێک دەردەپەڕی ودەگەیشتە گوێ یەکانی بیسەر.ئەمکارە تەنیا زەمانێک دەلوا ئەنجام بدرێ کە وێژەروبیسەر تەواو لێک نێزیک بان ودەنگی یەگدی یان بیستبایە . دیارە ژمیاری بیسەران لەم سیستیمەدا زۆر کەم بوو.

پاش پەرەگرتنی "نووسین" واژە و بیر و باوەڕی نووسەر لەسەر شتی جۆراوجۆر نەخشی دەبەست ودەکەوتە بەرچاوی خوێنەران . دیارە ئەو سیستمە دەتوانێ لەرادەبەدەر خوێنەری هەبێ .

ئەم دو سیستمە لە دیاگرامی ژێرەوەدا خراونە بەرچاو .

**١-"دەورەی پێوەندی دەنگ "**

هەر وەک لێرەدا نیشانمانداوە .سەرهەڵدانی خەت ونووسین ئاڵ وگۆڕێکی گەورەی لە بڵاو بوونەوە و راگوێزرانی فکر و بیرەوەریێ دا هەبووە .

بەرهەمی ئەم ئاڵ وگۆڕە گرینگە لە هەموو لایەنەکانی ژیان تاک و کۆمەڵدا دەبیندرێ . یختراعی خەت ونووسین وەک رووباری پڕئاوی خورێن زانست وهونەر وئەزموونی ئادەمیزادی لە تێداچوون رزگار کرد و لە جێگەیەک دا رایگوێزتە شوێنەکانی دیکە .تا ئەو جێگایەی کە دەتوانین بڵێین سیستیمی نووسین وزەبت کردنی فکر وبیرەوەری لە رێگەی نووسینەوە هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ پێشەوە کە ئەگەر هەڵنەهاتباوە ئێستا لە تاریکی نەزانین دا پەلەقاژەمان دەکرد.

ئەمرۆ نووسین و خوێندن دەورێکی بەرچا - ویان لە ژیانی رۆژانەماندا هەیە کە بەبێ ئەوان ئاگامان لە شارستانەتی زانست و تیکنۆلۆژی نەدەبوو.

# زێوەر

**عومەر فارووقی**

خوالێخۆشبو مەلا عەبدوڵڵا یەکێک لە پیاوە هەرە ئازا و زاناکانی گەلی کوردە کە شیعر و پەخشانی ئەو بەتایبەتی شیعری ئایینی و نیشتمانی ئەو شاعیرە گەورە وەکوو ئەستێرەی گەش تیشک دەپرژێنن وچاوی ئەویندارانی گەل وولات روون دەکەنەوە.

زێوەر ناوی عەبدوڵڵا و کوڕی محەممەد ئەفەندی بووە کە ساڵی ١٢٥٤ی کۆچی هەتاوی لە شاری سولەیمانی لەدایک بووە. زێوەر وەکوو هەموو منداڵانی خوێندەوار رووی کردۆتە حوجرە و مزگەوت و لە کوردستانی پان وبەرین لە خزمەت مەلا گەورە ودەرس بێژە ـکان لە بانە و سەقز و مەهاباد وسەردەشت ورەواندوز خوێندنی خۆی تەواو کردووە و بەسەر زمانی فارسی و عەرەبی وتورکیش دا زاڵ بووە و لە ئاکامدا لە ئەستەنبوڵ ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ سولەیمانی و بووە بە ماموستای زمانی تورکی ئەستەنبوولی لە فێرگەکانی سولەیمانی دا و پاش ٧٣ ساڵ تەمەن لەساڵی ١٣٢٧ی کۆچی هەتاوی دا لە سولەیمانی کۆچی دوایی کردووە وتەرمی پیرۆزیان لە گردی سەیران ناشتووە.

زیوەر شاعێریک بووە بە دین وخۆپارێز ولەخوا ترس ولەگەڵ ئەوەش دا مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر و کوردێکی پەتی وبێ غەل و غەش بووە وهەر لە سەردەمی جووڵانەوە و بزوتنەوەی حەق خوازانەی خوالێخۆشبوومەلیک مەحموودی نەمر، ئەویش باسکی لێ هەڵماڵیوە و لە خزمەتی ئەو بزوتنەوەدا بووە...... دیارە شێخ مەحموودی نەمر حەفید.ی حەزرەتی حاجی کاک ئەحمەدی سولەیمانی بووە و زێوەریش وەکوو پیاوێکی ئایینی و شاعیرێکی بەهەست لەو بنەماڵە گەورە ئایینی و نیشتمانی یە جیا نەبۆتەوە.

شوێنەوارەکانی زێوەر بریتین لە:

١- دەستەگوڵی لاوان کە سرودی نیشتمانی یە و ساڵی ١٣١٦ی کۆچی هەتاوی چاپ کراوە

٢- خێوی ناو مزگەوت چاپی ساڵی ١٣٢٥ی کۆچی هەتاوی.

٣- دیوانی شیعر کە

پاش مردنی خۆی لە ساڵی ١٣٣٧ی (ک.ھ)دا چاپکراوە

٤- گەنجینەی زێوەر کە ساڵی ١٣٤٦ (ک.ھ) بەحەول و تەقەلای مامۆستا محەممەد مەلا کەریم وھاوکاری مەحموود زیوەر بە یارمەتی ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری لاوان لەچاپ دراوە

گەنجینەی مەردان لەسەر شیعرێکی شاعیری نەمری ئێران واتە سەعدی شیرازی بەدی ھاتووە کەفەرموویەتی:

شرف مرد بەجور است و
کرامت بەسجود
ھرکە این ھردو ندارد
عدمش بەز وجود

یانی: شکۆی پیاو بە دەست بڵاوی یەتی ومەردایە — تیشی بە خواپەرەستی یەتی. ئەوەی ئەو دوانەی نەبێ تێداچوونی زۆر چاکترە لە زیندوو بوونی.

مامۆستا زێوەر لە سەرەتای گەنجینەی مەردان دا نووسیویەتی: ئەم گەنجینەیە گەنجێ نیە زێڕ و زێوەرو جەواھێراتی تێدابێ بەڵکوو گەنجێکە سەد ھەزار بە قیمەت تر لەھەموو جەواھێراتی تێدا نووسراوە، خەزنەی مەردانە ،گەنجی پیاوانە ،ئەو پیاوانە کە گوڵی باغی ئینسانی یەت ومەردی بوون.

لە کتێبی زێوەردا بۆ ئەو پیاو ومرۆڤە بەناوبانگە کوردانە باسی تایبەتی دانراوە و وەکوو مرۆڤێکی بەنرخ ڕێزیان لێ گیراوە.

١- عەشیرەتی جاف (مەحموود پاشا)
٢- تاھیر بەگی جاف.
٣- شێخ مستەفا نەقیب.
٤- شێخ ڕەزا تاڵەبانی.
٥- برایمئاغای خۆبیلە
٦- شێخ مارف قازانقایە.
٧- شێخ مارفی نەقیب.
٨- شێخ عەلی حیسامەدینی نەقشبەندی.
٩- محەممەدئاغای کۆیە.
١٠- قادرسەعید ئەفەندی.
١١- ئەمین زەکی بەگ
١٢- عەلی کەماڵ بەگ
١٣- تۆفیق قەزاز.
١٤- شێخ عەلائەدینی بیارە
١٥- مەلا عەبدوڵلا مودە — رریس.
١٦- شێخ مەحموودی نەمر
١٧- شێخ محیەدین ھەولێر
١٨- سەیدئەحمەدی خانەقا
١٩- حەفسەخان کچی نەقیب شێخ مارف
٢٠- پیرەمێردی نەمر.

پاش ئەوانە دەچیتە یادی رۆژانی دەربەدەری، کە ئەویش داستانێکی جیای ھەیە ومەبەست و بنەڕەتی ئەو وتارەیە.

ھەر وەکوو دەزانین کاتی کە خوێن مژە بریتانیەکان نۆکەریکیان بەناوی فەیسەل بۆخویان دۆزیەوە ودەوڵەتی عێراقیان پێک ھێنا ھاتنە سەر ئەو مەبەستە کە ناوچەی پڕ لە کان و تەلای ڕەشی کوردستان بخەنە ژێر چاوەدێری خۆیان وکاربەدەستە بەکرێ گیراوەکانیان و بەم بۆنەوە دەستیان کرد بە سەرکوت کردنی حکوومەتی کوردستان بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموودی نەمر و سەرئەنجام لەشەڕی قارەمانانەی دەربەندی بازیان دا و بە ھاوکاری موشیری حەمەوەندی خۆفرۆش بەسەر سوپای کوردستاندا زاڵ بوون و شێخ مەحموودی نەمریان وەکوو شێری زەخمار لەبن بەردە قارەماندا پەیدا کرد وبەناوی شارە بەدەر ناردیانە ھیندوستان و ژن ومنداڵی شێخ بەرەوکوردستانی ئێران وەڕێ کەوتن وئاوارە بوون کە مامۆستا زێوەریان لەگەڵ بووە و یادداشتی دەربەدەری نەتیجەی ئەم دەورەیە. بەداخەوە لەو سەردەمەدا سەرۆک وەزیری ئێران وسووقەلدەولە بوو کە قەراردادی نگریسی ١٢٩٨، کۆچی ھەتاوی مۆر کردبوو و یەکێ بوو لە دەست نیشاندەکان و نۆکەرە ناسراوەکانی بریتانیا و کاتێ زانی کەژن ومنداڵی شێخ مەحموود ھاتوونەتە ئێران وعەشیرەتە کوردەکان یارمەتی یان داون فەرمانی دا بە شەریفەلدەولە حاکمی کوردستان کە بەرگریان بکات

وئەویش هەر بەو تاوانە ڕۆستەمخانی بانەو حەبیب – وڵڵا خانی تیلەکۆیی لە سێدارە دا و هەرەشەی لە پیاوە گەورەکانی دیکەی کوردستان کرد کە ئەگەر یارمەتی ئەوانە بدەن چارەنووسیان مەرگە چون شێخ مەحموود دژ بەبریتانیا جوولاوەتەوە دەبێ خۆی و لایەنگرانی سزا بدرێن

مامۆستا زێوەر پاش ئەوانە شان بەشانی لەگەڵ ژن ومندالی شێخی بەردە قارەمان (شێخ مەحموود) لەبەر گیروگرفتی کاربەدەستانی بەکرێ گیراوی ئێرانی ئەودەمی سەر بە ئیستیعماری بریتانیا ، بەردا و بەردو هەردا وهەردی سەرشیو و گەورک وتورجان و فەیزوڵڵا بەگی پێواوە وهەردەم مێوانی ساحێب خوان و سەرۆک و عەشیرەتێک دەبن تاسەرئەنجام شێخ لە دەربەدەری نەجاتی بووە وئەوانیش گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان . مامۆستا زێوەر وەکوو نووسیویەتی لەگەڵ بنەماڵەی شێخ دا ماوەیەکیش لە خزمەتی جەنابی سەیدی زەنبیل دا ڕایان بواردووە. ئەویش پاش ئەوە بووکە شەریفەلدەولە حاکمی بەکرێ گیراوی ، کوردستانی ئێران ڕۆستەم خانی بانەی بانگ کردبوو بەناچار بەرەو موکریان وەڕێ دەکەون و ڕۆستەم خانیش پاش ئەوان لە سێدارە دراوە کە مامۆستا زێوەر ئەوەی نەنووسیوە. بەڵام دەنووسێت ( من لە پێشەوە چووم بۆلای ئاغای تورجان کە بەڵکوو یەکێکمان بۆ شارەزایی لەگەڵ بنێرێ ، چوومە ناو دێ سەیری ئاساری قەدیمی تورجانم کرد و تەماشای مەدرەسەی مەرحوومی مەلا عەلی قزلجیم کرد . مەدرەسە لە ئەو کاتە بوو بوو بە ئەنباری کایە و لەو شارەدێی تورجانەدا بیست ماڵێکی ڕەش و ڕووتی تێدابوو. ڕووم کردە قەڵا یەعنی قوناغی ئاغا ، چوومە ژوورێ تەماشام کرد ئەحمەد بەگکە ئاغای ئەوێ بوو نوستووە. قەدرێ دیقەتم کرد لە وەزعی بنیادی وئەساسی حەقیقەت مەنزەرەیەکی خۆش و مەقامێکی عالی هەبوو ، دەنگم نەکرد، گەڕامەوە لە پایین قەڵاکانی ئاوێکی ساردی لێ بوو چووم لەوێ ئاوم خواردەوە.... بەڕاستی سەرنجی یادداشتەکانی دەربەدەری ئەو شاعیرە گەورە ومەزنە ئەویش لەگەڵ بنەماڵەی شێخی نەمردا ، هەموو نیشتمان پەروەرێک دێنێتە گریان و لەگەڵ ئەویشدا سەرلێ شێواوی و چەند بەرەکی و چارەڕەشی گەلمان بۆ دەردەخات .

لێرەدا دەگەڵ دەربڕینی ڕێز وقەدر وئیحترامی خۆم بۆ ڕەوانی پاک و مەزنی زێوەری نەمر بە پێشکەش کردنی شیعری ئەو خوالێ خۆشبووە کۆتایی بەم وتارە دێنم .

ئەی وەتەن چەن خۆشەویستی ڕۆحی شیرینی منی
مەزرەعەی توخمی نیشات و مایەی ژینی منی
بێت و گەر من کۆکەن بم ، وەسڵی شیرینم بەنێ
تیشەیی نادەم لەبەردت ، تۆی کە شیرینی منی
گەرچی ئەرزی هێند بڵیندی، وەختە لای من بچیە عەرش
واسیتەی سەربەستی و ئیجرائی ئائینی منی
ئیفتیخاری میللەتی، تۆی مادەرێکی میهرەبان
خوا هیلالیشی بە تۆ دا ، ماە و پەروینی منی
نەوبەهاران بەو هەوای زۆر سافەوە وەک جەننەتی
فەسڵی زستانیش سەراسەر باغ و نەسرینی منی
بۆچی نەتدی جسموجانی خۆم بە شاباشت نەکەم
خاک ڕاهی حوکمرانی عیز و تەمکینی منی
ئارەزوو وفیکری سەیاحەت ناکەم ئیتر ئەی وەتەن
تۆ لەجێگەی قاهیرە وتاران و بەرلینی منی

# حاتەم و حەزرەتی عەلی (د.خ)

ئەوەل بناڤێ جەبار
هەفت شەڤان وهەفت رۆژان
دگەل سیارێ ئەسحابان
بوویە شەڕ و هەلێدان
...چەپەر برنە خار
رۆژەکی ژی وە لێ هات
کافر کاغەز جەبینیت

هەچێ سەرێ عەلی ژبۆمبینیت
کیژەکی ژمن بستینیت
" نکمە " رابوو هلستە*
دەستەک دانی سەر دەستە
پێشی شاهی راوەستە
شاهم یا دستم ئشکەستی
شاهم یا سەرم ئشکەستی
بووت و سەنەمێ گەوران
عەلی بچتە بەر عەوران

سەرێ وی تینم تەوران
بووت و سەنەمێ گەوران
عەلی ب نوور شێران
ناو چەنگم نابیت خەلاس
ناچمە عەلی ب تەنێ
گەل من بدە قۆشەنێ
عەلی من دک ئەفەندی
شیرەک هەیە زولفقار
دبڕیتن وەکی خیار

نک ته بیمه شەرمەزار
نک ته بیمه شەرمەزار
جارچیان جار دانەکێشان
گو بەرب سووکا دخوەشن
هنک وەک کەران ...
سووکا دگێڕن چین بە چین
بۆ سەرێ عەلی دەچین
ئەو تۆلا ئەبووجەلی

* * * *

ڕۆژەک ڕۆژا ئەیینی
موحەمەد وێ بانگ هلتینی
دبێژی هەچی گۆشت نێچیر
بۆم بینیت
قەسرەکی من بستینیت
شریکێ منە ل وێ ڕۆژێ
دوور بیت ل ئاگرێ دۆژێ
دیوانا ئەسحابانە
فیهۆڕس※ لێ ڕاوەستانە
ئەسحابە چلان پترن
یێ ژ مێرا چێترن
ناو چاڤێ هەڤ فوکورن
کەسی نەدا جەوابە
خێنجی حەتەمێ ڕەوالە※
حەتەم رابوو هلستە
دەستەک دانی سەر دەستە
گۆ نەبی ڕۆنایا چاوانە
دچم بە دل و گیانە
شریکی تەمە ل وێ ڕۆژێ
دوور بم ل ئاگرێ دۆژێ※
بەلکە خەتێ ببینم
قەسرەکی ل تە بستینم
حەتەم رابوو بێ خەبەر
.هەسپ کێشابوو دیسا دەر
لێ کربوو زینی زەر
کەلە لغاف دانە سەر
پێ دانابوو زەنگوویێ※
یائەللاه کو خودا دگەل

حەفت شەڤان وحەفت ڕۆژان
گۆشت نێچیر نەبووقسمەت
گو حەچێ کۆڕێ بابان بیت
تنێ تنێ بترسیت
حەموو جاران بترسیت
چوو قەحتایێ ڕاوەستا
پێ ناوەستن سێ وچار
کافرا ڕێکرنی دو سوار
دو سوارێ نامدار
گۆ حەتەم هاتن کەن گرتن
تۆ دۆستی یانی دژمن
ئەمدێ تە بکەن کرتن
حەتەمێ خوە بوویە خوەش
کێشا مسری یێ دەڤ ڕەش
یێک ل عەردێ کرە لەش
یێک لێ پەلەپەل دچوو
هەوار کو من بەد هەوار
کو کری تەکە سوار
یۆلداشم کوشتن یێکجار
وەختە مبکە بریندار
کافر ڕێکرنێ چەند سوار
کافر ڕێکرنێ دەه سوار
دەه سوارێ نامدار
گۆ حەتەم هاتن بکەن گرتن
تو گەل مەبوویی دژمن
ئەمدێ تە بکن گرتن
حەتەمێ خوە بوویە خوەش
کێشا مسری یێ دەڤ ڕەش
نەه ل عەردێ کرییە لەش
یێک لێ پەلەپەل دچوو
هەوار کو من بەد هەوار
کو کری تەکە سوار
یۆلداشم کوشتن یێکجار
وەختە م بکە بریندار
کافر ڕێ کرنێ چل سوار
چل سوارێ نامدار
گۆ حەتەم هاتن بکەن گرتن

تو گەل مە بوویی دژمن
حەتەم مێرەک زۆرە لۆ
دەستدا شیرێ ڕاوە لۆ
یێک لی پەلەپەل دەڕۆ
هەوار کو من بەد هەوار
چ کری تەکە سوار
یۆلداشم کوشتن یێکجار
وەختە م بکە بریندار
گو سەنەم مالا تە خرا بیت
کەس شەری بۆتە ناکەت
ئەگەر دشێ خۆ هەڕۆ
ئەگەر نەشێ بەر بڕۆ
ئەو عەلییە هەر بوخۆ
کافر وێ زۆردا تێتن
وەکی کەران دزریت
وەکی سان ژی دلووریت
تو مەندالێ چ کۆڕی
سوارێ هەسپێ دبڕی
تو دگەڕی سەرێ عەلی
ئەو تۆلا ئەبووجەلی
بزانە عەلی ئەزم
مارەکی هەژدە گەزم
نەبەزیمە و نابەزم
قەساسێ سەرێ وە ئەزم
ئەز مەندالێ لە کۆڕم
سوارێ هەسپێ دبڕم
ئەز پشت ل حەق دخوڕم
لێرە سەران دبڕم
یێک یێ کۆر ویێ بێ پیل
خەبەر دانە یێ ب کین
بلند بوونە یێ ب شین
کافر گورزێ دهەژینیت
چل وچیا لەرزینیت
چشمێ کوربیت نابینیت
ناڤگوهێ حەتەم دادینیت
تەعامێ چاردە سالە
ل زاری کرە تالە

جبرائیل عەردێ خوری
حەتەم وی دناڤدا فری
خالقێ کولل جەبار
بەژنا وی وەکی چنار
تە داوێمە سەیێ مرار
کەر نەکە بینا خیار
تە دبەمە سەرهۆستایی
تە دکەمە نال و بزمار
دکمە پێ دوندلی نازدار
یا قەواتا رەحمانی
قۆلێ وی گران بوو
حەفتسەد باطمانی
کرە توپ ملان ئانی
کافر ۆ لەعنەلێ یۆ
لەعنە دێ و باڤێیۆ
یاوە دەس مە نەدیمە
ئەز بو وەرا قەسابم
سەرێ وەرا هاتیمە
تنێ تنێ هاتنێ
حەتا لێ کوشت حزارە
گوه بدەنێ بوسولمان
چ شەرەکی گرانە
شەرێ حەتەم گەل وانە
سەری ل وان فراندن
عیار ل وان دراندن
سەر ئینانە هۆلانی
روح ئینانە جۆلانی
وەکی مامێ حەیدەرە
ددە ئەللاه ئەکبەرە
گوه بدەنێ بوسولمان
دبێژن وەرن لاوێ
بەژن سپیندار
دەورەکی لێ وەرینن
هەسپ و چەکا لێ بستینن
گوه بدەنێ بوسولمان
تە دی کافران چ کرن
حەتەم ل ناڤ رما ئاسێ کرن

سەرێ حەتەم ژێ کرن
کافرەک هەبوو ناڤ تەتەر
ئەوان دگۆتنێ تەتەرخان
هەسپێ خو داژۆت چار نال
چل و چیا ب نەواز
ئەوی بوویە مزگین خاز
گۆشاهم سەرێ عەلی بۆتەهات
خزینێ شاه و پادشاه
کلید پێڤە هلکێشان
رێکرنە فەقیر و دەروێشان

* * * *

رۆژەک رۆژا ئەینی
هەسپ چۆیە خودان مایە
رۆژەک رۆژا ئەینی
ئیمام وێ بانگ هلتینی
دبێژیت یەقین حەتەم نەمایە
ئیمام سووند دخوت یاسینێ
ب سوورەتێ سوبحانی

ب سێ جوزێ قورئانێ
هنگی دێمە مەدینێ
حەتا زەنگیا دندلێ

دگریت خوینێ
هەسپێ حەتەم سەرکێشە
ئیمام پێ بوو دەروێشە
ئیجا چوویە ئۆبە ئۆب
دینا خودایێ چەند مەیتەک
کەتینە کۆرێ
جەندەکێ حەتەم سپی یە
وەکی جاوی یە
نوور قوبە لێ رابوویە
سلاڤەک سەردا کری
راکردا بەر سمبێلە
بێن کری تەرزی گولە
گۆ مامۆ دوەعدێ نیرۆ
مخوە ئینا شوینا تۆ
زارم حشک بوو ل تینان
ملم شل بوو ل بەر برینان
ئەز ماقوول بووم غەزایێ
کافر زۆر بوون بریا نایێ
رۆژەکی حەتانی ئێڤارێ
جەندەکی حەتەم دانی سەر
پشتا دوندلێ

دبینا مەسکەنێ دێوان
گۆ هاتم هاتم هاتم
کۆڕێ میرێ زەنگوو باتم
بۆ دیتنا شاە هاتم
خەبەر من بهیست کەلۆ
بابم گۆتە من بڕۆ
گۆ ئەو راستە دەرەو نینە
ئەم دێ بێنە سلاوکار
کۆمێ زێڕان بکەن بار
گۆ راستە درەو نینە
م کیژا خوە پێ دایە
ئەز خەزوورم «نکمە» زاڤا
ئیمام وێ چوبوو دەردا
سبە خێرەک دایە سەردا
ئۆدە حەموو حشک بوون دحالێ
خەوەدا
شاە تنێ گەل خەبەڕدا
پەیایۆ تو ل کیندەرێ
ب سیلاحێ چەپەرێ
گو شاهم هاتم هاتم
کۆڕێ میرێ زەنگوو باتم
بۆ دیتنا تە هاتم
خەبەر من بهیست کەلۆ
بابم گۆتە من بڕۆ
گو ئەو راستە درەو نینە
ئەمدێ بێنە سلاوکار
کۆمێ زێران بکەنە بار
گۆ راستە درەو نینە
م کیژا خوە پێ دایە
ئەز خەزوورم «نکمە» زاڤا
گۆشاهم ئەز ئیتیمەکە قەناسم
سەرێ عەلی نیاسم
ئیتیمەکە دمل بووم
رۆژەکێ ژی وە لێ هات
ئۆردی یا محەمەدی یان
ل سەر مە داهات
حەفت سالا ئەز ئێخسیری یێ دا

گرتمە برمە
حەفت سالا م مەیتەری یا
دندلی کریە
چوو غەدار وێ دبەزن
بۆ سەری حەتەم لەزن
سەرێ وی دەردا هاتێ
سەرێ وی دگەل مامێ خەبەردا
گۆ مامو وەعدی نیڤڕۆ
مخوە ئینا شوینا تۆ
زارم حشک بوو ل تینان
ملم شل بوو ل بەر برینان
ئەزماقوول بووم ل خەزایێ
کافر زۆربوون بریان نایێ
گۆ شاهم ئەڤا قەت سەری
عەلی نینە
گاڤانەکی ب لۆخینە
شڤانە پەز چێرینە
عەلی یێکی تەمەنێ منە
قەد و قامەتێ منە
هەر بخۆ وەکو منە
رێدینە بینا منە
«نکمە» رابوو هلستە
خەنجەر هەژدە بهۆستە
وێ پشت ئیمام راوەستا
م نەگۆ تو مێڤانی
خەبەر ددەی نەزانی
روحێ تە دکێشم جانی
گوە بدەنێ بوسولمان
تە دی ئیمام چ کر
سەری د پاغەلا خوە کر
مستەک داینا زێرچەنێ
سەر بینا گولێ هەڤدەرەنگ
هول کرن کوشک و سەنەم
کافر ۆ لەعنە لێ بۆ
لەعنەل دێ و باڤێ یۆ
گۆ وەدەس من نەدیمە
ئەز بۆ وەرا قەسابم

سەرێ وەرا هاتیمە
گوە بدەنێ بوسولمان
تە دی ئیمام چ کر
زولفەقار وێ کیشایە
یێکجار ئۆدە بڕییە
هەر تەرفدا هاتە خار
گرمە گرمێ سواران
تینی هەرچار کناران
سەری ل وان فڕاندن
※عیار ل وان دڕاندن
هنگی مامێ حەیدەرە
ددە ئەللاه ئەکبەرە
روح ئینانە جۆلانی
سەر ئینانە هۆلانی
دوندلێ وێ بهیستی
پێ خوە کرە فرتۆنە※
حەفت زنجیر قەتاندنە
حەفت دەرکە ئشکێناندنە
چۆک دانانە بەر کەلۆ
راکردا سەر پشتا خۆ
یا ئەللاه ب ئیزنی تۆ
هەر نا کۆمەکان دچۆ

* * * *

وەکی خەزەلێ بهاران
وەدچنە بنێ داران
هند کوشتنە مراران
وەکی خەزەلێ پاییزان
وەدچنە بنێ گووزان
هند کوشتنە دین سزان
جبرائیل وێ بحەشتێ
دکە سەیران و گەشتێ
دبێژی هیڤی یا من عەورێ
رەشە تاری
هوور بارانەک لێ باری
ئاڤ خوون پێکڤە ددەنە
رکێفا شەنگە سواری

کۆکە: لە ناوچەی بۆکانەو لە چەند کیلۆمیتری ئەو شارە هەڵکەوتووە.
ئاوایی یەکانی قەرەڵێ ، چوار دیوار و دەروێشان دەوریان داوە .
گردەبۆر شاخی پێش بارماغ و بستووی خڕی سوورەقانگ وچۆمی قوڵەبۆز سنووری ئەم ئاوایی یە دیاری دەکەن .

قوڵەبۆز ئەو چۆمەیە کە حاجی کاکە رەحمانی شاریکەند پەنجا ساڵ لەمەوبەر گوتوویە .

هەتا گاڕان لە (یەڵتڕ)دا دەکا مۆز
هەتا جاری دەبێ ئاوی قوڵە بۆز
هەتا سەقزی بەقەڵپووز ئێژێ قەڵپۆز
لە باخەڵتا بێ دایم دڵبەری قۆز

ئەگەرچی من لە تەمەنی پێنج یا شەش ساڵیدا لەم دێیە ڕۆیوم بەلام ئێستاش کە ناوی کۆکە دەبیسم مچوڕکی خۆشیم بە لەشدا دێ. خۆشەویستی وەتەن لە ئیمانەوە. بۆیە لەم دوایانەدا چووم و کۆکەم دیتەوە ودڵ و دیدەم پێی روون بۆوە و ئەو بەستە شیعرەشم بۆ نووسی :

کۆکە ئەی کۆکە و ئەی نیشتمانم
خۆشەویستر لە هەناو و گیانم
کۆکە ئەی جێگەی لەدایک بوونم
کۆکە ئەی مایەی بیری روونم
کۆکە جێت لێ نەبێ وەک بەهەشتی
لە حەوت دەرکە بە دوورو هەشتی
کۆکە هەرتۆی بە تەنێ بەرکۆژە* ؟
خاکی کوردانم هەمووی بێ بۆژە*
کوردستان هێزی هەناوو دڵمە
کێو و دەشت و دەری ئاوو گڵمە
«چوار دیوار» و «قەرەڵێت» جێرانە
هەم «قزل گوممەت» و «دەروێشانە»
«کانیە سەرداری» تۆ ئاوی جوانە
ئاوی سەرداری هەموو کانیانە
«کانیە زێڕینەتە» ئاوی ژینە
«گردەبۆر» و «تەپی بۆزان» شینە

من وەبیرمدێ کرا جەنگەڵ وباغ
چڕو هەڵدێری زەوی پێش «بارماغ»
«کۆڵکە رەش» مووچە درۆزنەت ماوە
وەکوو جاران «قولەبۆز» پڕ ئاوە
«حاجی دەروێش بەگە»چاکی بەشەمە
گۆڕی هەر لاتە برام «کاکە حەمە»
تۆ ببووری لە هەموان ئەی خوایە
هەرچی گۆرسانی لە کۆکەیدایە
کۆکە پێیان ئەوتی شیرازی
بۆمە مانانی جێگەی شانازی
«حاجی باپیر» و «حەقیقی» و «کۆکی»
خاڵەمینیش بلێ یخ دالۆکی
ئێستە جێی وانە بوێژت کێنە
چ لە گۆڕایە بفەرموو....بێنە
داخەکەم ئێستێ ئەوانەی دەگەنێ
بە دوو پۆند خۆ دەفرۆشێ ودەگەنێ
چ سیاسی چ بەرەی عیرفانە
خڕی بۆ پارەیە بۆ گیرفانە
تۆ بلێی بۆمە پەیابێ مەردێک
تۆ بلێی هەستی لەنێو کورد کوردێک
بلێ من کوردم و هەر کوردم ئەوێ
بەرجی ئەو مافە هەچی بێ نەمەوێ
تۆ بلێی یەگدری کوشتن بەسکەن
تو بلێی گوێ بەقسەی هیچ کەس کەن
تو بلێی تۆرەمە گیرخا قەلەمێ
بەروبووی هی قەلەمی بکا هەڵەمێ
خالی خۆم هەرچی لەپێش نووسرابێ
دەبێ هەرچۆنی قەلەم لێی دابێ
ناهومید نین لە بەزەت ئەی خوایە
هەمی ئێستاکە هەمی لە دوایە
کۆکە گیان رۆیم و جا ماڵ ئاوا
رەبی تا هەی لە جیهان بی ئاوا

کۆکە: بە قەولی کابرایەک کە گوتوویەتی کۆکە شیرازی کوردەواری یە و چوار شاعیری لێوەدەر کەوتوون.

یەکەم: شاعیری بەناوبانگ **مەلا مارف کۆکەیی** کە سەردەمێک مەلای بابم بووە و کەمکەس هەیە نەیناسێ.

دووهەم: **حاجی باپیرئاغای شێخ ئاغایی** کە شێعرەکانی ئەو دەبێ لەماموستا حەقیقی وەربگرین کە مامی بووە.

سێهەم: **کاکەباسی حەقیقی** کەشاعیرێکی بەرز وسەری کەیف وبرێک لە من بەتەمەنترە.

چوارەم: قرپۆک وپاشەرۆکی هەموان **بۆخۆم خاڵەمین**.

ئەو سەردەمە کە من لەچاخی شلکی و ساوایی دا لە کۆکە ژیاوم دوو کارەساتی دڵتەزێن روویداوە، کە بەلای من گێڕانەوەی ئەم رووداوە پڕ سفت* و سوێ یانە بەهرە و کەڵکی ببێ بۆ ئەوە کە بەشکوو هێندێک پەندی لێوەربگرین.

**یەکەم**: هاتنی رووسی تەزار بۆئێران بەتایبەتی مەڵبەندی کوردستان لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا (ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی) کە بەوێران بوون وکوشت وکوشتار و قەلاچۆی ولات تەواو بوو. هەرچەند بەڕواڵەت دەولەت بوو بەلام سەد خۆزگە بەبنیادەم خۆرەکانی جەنگەڵ.

هەڵبڕ هەڵبریان وەخەڵک خستودەستیان بە کوشتار و قەلاچۆ کرد بۆ وێنە، ئیندرقاش ،قومقەلا، سابلاغ و چەند جێیەکی تر کە عەلی بەگی حاجیالی کەند (هەیدەری) بە بۆنەی ئەم کارەساتە ئەو شیعرانەی گوتوون کە هێندێکم لەبیر ماون.

لەو دەمە تاقم لەدیداری عەزیزانی وەتەن
دایمە جووتم لەگەڵ غەم هەمدەمی حوزن ومیحەن
حوببی تۆدینی منە ئایینی من،ئیمانی من
یادوفکری ئاووخاکت شوغڵ وویردی من وەتەن

حەیفە وابێ قوتبە قیبلەت بی سەفا
باغی سەفا
سەیرە وابێ سەیرە پرد و گۆلەکەی
قازی حەسەن
مینبەر ومزگەوتی سوور وحوجرەکان و
حەوشەکەی
بوو بە مەیخانەوتەویلە مەعبەدی
عەبدی وەتەن
جێی مەلاکان وئیمام و مەدرەسە و
نەشری علووم
پاکی جێ دەستەی قوشوون وپاکی جێی
وەعزی قەشەن
حەشرە واوەیلایە ئەورۆ، کەربەلایە
شاری مە
کوشتنە، تالانە، یەخسیرە، گەوادێن
و دەبەن
دلبەرانت بوونە یەخسیر چوونەقەفقاز
و سەبیر
رەنجی موسلیم بێ حیسابە، رەحمەتێ
یا موستەفا
زولمی کافر بێ ژمارە غەززەبی یا
زولمینەن

دووەم: گرانی! گرانی بۆچی هات؟
گوتم: رووسەکان سالی ١٣٣٢ی کۆچی قەدەمی ناپیرۆزیان ناولات، کوشت وبڕیان دەستی پێکرد و جەزرەبەی خەلکیان دا. جووت بەندەکان نەیاندەوێرا لەدێ وەدەر بکەون شێوەردبڕین وداچاندن پەکی کەوت زەوی هەموو بوونەوە بوورە وبەیار. گرانی لە حیسێب بەدەر هێرشی هێنا سەر گیانی کورد و کوردستان. مال هەر نەبوو مێوان لەوەندیشی کرد !!.

لەماوەی نیزیک بە دوو مانگ باری گەنم لە دوو تمەنەوە گەیشتە سەدتمەن و هیچ شتێک بایەخی نەما. مەڕ بەدوو تمەن. مانگا بە پێنج تمەن ئەویش کەس نەیدەکڕی. جا سەت تمەن چۆن پەیدا بێ تا بارێکی گەنم پێ بکڕێ؟!.

خەلک دەستی کرد بە سوال و وەدەر کەوتن لەو دێ بۆ ئەو دێ. باشم وەبیر دێ کە تاق وجووت دەهاتن بەرگیان هەموو رندۆل* ولەشیان ئێسک و پێست بوو. دەتگوت وێنەی یەسک بەندی لەشن.

پیاوەتی هیچ، بەزەییش هەر نەمابوو. گێڕایانەوە لە ئێوارەیەکی لای رۆژپەڕدا، ژن وپیاوێک کە منداڵێکیشیان پێدەبێ دێن لە قەراغ دێ دەچنە خانووە چۆلێکەوە. سبەینی کە وەدەر دەکەون بۆ سوال منداڵەکەیان پێ نیە. خەلک لێیان دڕدونگ دەبن ودەچنە پێش دەپرسن:

"- کوا منداڵەکەی دوێنێ؟
"- ئێمە هیچ منداڵمان پێ نەبوو..

بەکورتی دەچنە خانووەکەودەبینن ئەوە کەللە سەر وورگ وریخۆڵەی منداڵەکە کەوتووە و دیارە خوراوە ...

سەرت نەیەشێنم ئەگەر رووداوەکانی ئەوساڵە بگێڕمەوە - هەر لە دەیان یەک- کتێبێکی هەزار لاپەڕەیی پێ دەوێ. جا هەتا خوێنت خرا نەبووە رووپەرەکە وەربگێڕین بەلام با ئەوەندەش بلێم لە تەواوی کاتی گرانیدا کە نیزیک بە دوو سالی خایاند و هەزاران لاوی شلک وکچی چاومەستی لەناخی زەوی وخاکی رەش ئاخنی چەندین عەمباری چوارهەزار وشەش هەزار و حەوت هەزار تەغاری لەنێو کوردەواری هەبوو کە بەتەمای گرانتر بوون نەدران بەکەس.

جا نزامان لە خوای مەزن هەر ئەوە بێ کە زەوی بداتە دەست کەسێک کە بەزەیی بە خەلکدا بێ و کارەساتەکە جارێکی دیکە، جارێکی دیکە بە چاو نەبینینەوە.

کاتێک باسی بەیت دێتە گۆڕ، خێرا دیمەنی کوردێکی سەرورووخۆش ، لەنێوە*چوو ڕەزاسووک و دڵتەڕی دێهاتیت بە زەیندا دێ، کە پێچی هێناوەتە سەر برۆیان . دەستێکی لە بنانگوێ ناوە و بە ئەوی دیکە تەسبێحە سەد دەنکەکەی هەڵدەخلێنێ. دەنگی لێ هەڵێناوە ولە چەشنی خاسەکەوی سەر دوند سۆزی دەروونی لەکوڵێ، دەکاتە پشکۆی وشە و بە لێ*زمە دەیداتە دەر. زۆر وەستایانە ئەو وشانە دەکاتە رستە، رستەکان دەکاتە ملوانکە، ملوانکە دەخاتە ئەستۆی گ*راوی . گۆمیلکەی فرمێسکی چاوی گراوی کەلاو دەکا ، بە لوزە*وە وبە روومەتیدا شۆڕ دەکاتەوە نێوقوڵکی گەردنی دەیکا بە هە*توان، دەینێتە سەر برینی خەنجەر . بە شارەزایی یەکی کەموێنە دڵی سووتاووبرژاو، زوڵمو زۆری ،تاڵان وبرۆ، ئازایی مێرازایانە، جوانی جوان چاک ،لەخۆ بردوویی لەخۆ بوێر، ورشەی زرێ ومەتاڵ مەکۆی ئەوین ، دەستی بە خوێنی زاڵم، بەرۆکی دادڕاو، تەنانەت گەرمی فرمێسک وکزەی دەروون دینێتەوە بەرچاوی گوێگر. بێ ئەوەی بێڵێ پێ بزانێ، سواری باڵی خەیاڵی دەکا و بۆماوەیەک بەرەوپاشی دەباتەوە. تایبەتمەندی — یەکانی ژیانی کوردەواری لەپێش دادەنێ. لە ئاوات و ئارەزووەکان دەدوێ، ڕووداوە دڵتەزێنەکان دەژێنێتەوە. ژیانی باب و باپیران دەکاتە هەوێن ئەسکوێ لەمەنجەڵی مێژوو هەڵدەدا . جۆرێک لە ڕۆژە تاڵ وشەوە ڕەشەکانی بن و بنەچەکە هەڵدێنجێ ، وەک ئاوە ساردەکەی بەربناری قەندیل وسپی ڕێز بەگەرووی گوێگریدا دەکا وهۆگرتری دەکا .

ئەو بەیتەی کە ئێمە ئەورۆ بە یەکێک لە گرینگ ترین قوڵەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری نەتەوەکەمانی دەناسین دەبێ چۆن خوڵقابێ؟ کام پێویستی بۆتە هان دەری ئەو خوڵقانە؟ ئایا هەر بەیتە دەسکردی شارەزا و لێزانێکە؟ ئایا بەیت تایبەتی قۆناغی دەرەبەگا — یەتی بووە؟ ئایا بەیت هەر لەخزمەت دەرەبەگان دا بووە یا لەخزمەت هەموو چین وتوێژەکانی کوردەواریدا ئایا ئەو بەیتانە بەبێ کەموزیادی گەیشتوونەدەستی ئێمە؟ گرینگەتی وبایەخی بەیت لە ئەدەبەکەماندا تا چ رادەیەکە؟ دەتوانین چیان لێ وەدەست بێنین ؟ بۆ زۆربەی بەیتەکان " تراژێدی"ن ؟ ئێمەی هۆگر ولایەنگری بەیت دەمانەوێ بلێین چی ؟ وێدەچێ ئەو پرسیارانە و دەیان پرسیاری دیکە، بە

مێشکێ زۆران دا رابرن و
دوای وەڵام نەکەوتنیان
لەو سەردەمەدا ، گەلێ
مەترسی بەدواوەیە. مەترسی
لەپێش چاوکەوتن ، مەترسی
لەبیر چوونەوە وفەوتان .

بێگومان بەرەکانی داهاتوو
پتر قەدری بەیت دەگرن و
دەزانن چی لێ بکەن .
ئەڵبەتە ئەگەر ئەو
گەواهیراتە عەنتیکانەیان
بەدەست بگا .ئەوەش دەگەڕ —
ێتەوە سەرحەول وتێکۆشانی
ئیمڕۆی ئێمە. نابێ خۆمان
بەوە دڵخۆش بکەین کە
دواڕۆژ حەولی بۆ دەدەن و
مەترسی فەوتان لەگۆڕێ دا
نابێ ! لەبیرمان نەچێ
پاش بەهاری بە هەڵاڵە و
گوڵە مێلاقە و بەیبوون
خەملاو وهاوینی پڕ پیت و
بەرەکەت و فەرعانی، قەوسی
پایز وشکست وبەستی زستان
بەڕێوەیە. دەبێ دەستوبرد
بکەین .

گۆرانی بەیت دەبێ لە
زەمانێکی یەکجار زووە دەستی
پێ کردبێ. لەو دەمەوە کە
بەربەرەکانی دەستی پێ کراوە
لەو دەمەوە کەژن کۆڵەکەی
ماڵ بوو ، هێزی بوو، دەستی
دەڕۆیی ، پیاو بە قسەی
وی هەڵدەستا ورۆدەنیشت".
لەو دەمەوە کە چادروچیغ
ئاوریان تێبەردرا، ماڵ و
منداڵ ومەڕوماڵات بەتاڵان
چوو. لەودەمەوە کەخێڵەکان
پیاوی ئازای تالان گێڕەوەیان
بەخۆوە دی. لەو دەمەوە،
کە بایەخ بۆ ئەزموون
داندرا . لەو دەمەوە کە
کورد هەستی بەوە کرد کە
پێویستە رووداوە تاڵ و
سوێرەکانی نێو کۆمەڵی
بپارێزێ. لەو دەمەوە کە
پەنای بردە بەر لەبەر

کردن ولە زەیندا راگرتنی
رووداوەکان . لەو دەمەوە
کە بۆ هاسان لەبەرکردنیان
کێش وقافیەی دانێ وهەوای
بۆ ساز کردن .

رەوان ناس لەسەر ئەو
باوەڕەن ئەگەر کەسێک
بارستی دەردێکی گەورە یا
غەمێکی گرانی لەسەر دڵ
بێ بێتوو بۆی بگونجێ
پرێسکە بکاتەوە و کوڵی
خۆی هەڵڕێژێ، هەست بە
لەش سووکی و ئاسوودەیی
دەکا . ئەو بابەتە لە
خوڵقانی بەیتدا شوێنێکی
یەکجار گرینگی بووە .
ئەوانەی کەمتاکورتێک لە
مێژووی گەلەکەمان ئاگادارن
دەزانن کە کوردستان لەنێو
ئیمپراتوری یەکانی رۆم و
ئێران و لەو دوایانەشدا
لەنێو عوسمانی وئێران و
دراوسێکانی دیکەدا وەک
کەوڵی حەوت برایان لەبەر
یەک کێشراوەتەوە ! نێزەو
مەتاڵ بەدەست ،شمشیر لە
قەد، قەرەبینا و رەشۆک
لەشان ژیانیان بەدانیشتوانی
تاڵ کردووە ! قەتیان رووی
خۆشی بەخۆوە نەدیوە! ئاوارە
و پەڕیوە بوون ! هۆزەکان
لەجێی خۆیان هەڵقەندراون
تالان کراون ! مێگەلە
مەڕیان راماڵ دراوە ! زۆر
کارەساتی دڵتەزین و دوور
لە مرۆوەتی یان بەسەر
هاتووە! زۆرجار بەرەنگاری
دوژمن بوون. قارەمانانە
سەریان ناوەتەوە. ئەو
بابەتانە هەوێنی زۆربەی
بەیتەکانن . هەروەها
مەسەلەی ژن، ژنی کورد
سەرەڕای بەشداربوون لە
دەرد ورەنجی کۆمەڵەکەی زۆر

چەرمەسەری پڕ مەترسیش
بۆتە سەرباری دەردی ! هێز
و توانای لەدەست داوە !
بۆتە دیل و بەردەستی
پیاو! تەنانەت مافی
هەڵبژاردنی هاوسەریشی لێ
ستێنراوە !بەچاوی سووکەوە
روانیویانەتێ ! تەگبیری
پێ کراوە و بە قسەی
نەکراوە ! بە تالانیان
بردووە ! خوێنیان پێ
کوژاندوتەوە ! گاڵتەیان
بەژیانی کردووە! باب و
برای لەپێش چاو لەخوێن
وەردراوە! دڵی ناسک
بووە، بەباللۆرە وحەیران و
لاوک کوڵی خۆی هەڵڕشتووەو
سوکنایی* خستۆتە جەستەی
خەستەی. ئەو بابەتانەش لە

بەیتدا دیارن، دەتوانین
بەجوانی شوێنیان بگێرین
لێرەدا نابێ تێک هەڵچوونی
هۆزەکان لەگەڵ یەکدی و
هەل ومەرجی قۆناغی
دەرەبەگایەتی وەبەرچاو
نەگرین. دیارە ئەو دوو
مەبەستەش شوێنی گرینگی
لەسەر خولقانی بەیتدا ناوە
سەرجەم دەتوانین بڵێین
ژیانی رابردووی کوردەواری
وەک تراژدی دەچێ! هەر
بۆیە زۆربەی بەیتەکان
تراژدین . گوێ بۆ هەر
بەیتێک هەڵدەخەین بارستی
ژیانێکی پڕدەرد ومەینەت
بەتەواوی هێزەوە هەست
پێ دەکەین وکۆنەبرینمان
وەسۆ دێنەوە .

هەوینی بەیتەکان لە
رووداوی راستەوە هەڵێنجراون
سۆز،ناڵە،شکست ،سەرکەوتن
قارەمانەتی ، دەردوغەم،
گریان وشادی نێوبەیتەکان
لەگەڵ هی ئیمرۆ فەرقێکی
وای نەکردووە. گوێگر
هەناسە وهەنیسک ، خورپەو
خورتە، کزە وبۆسۆ، نرکە
و نەهرە، تەنانەت ویزەی
تیر و وشەی شیر هەست
پێ دەکا.هۆی پەرەسەندن
و لەدڵی خەڵک دا جێ خۆش
کردنی بەیت هەر ئە و
مەبەستەیە. گوێگر لەخۆشی
و ناخۆشی قارەمانانی
بەیتدا بەشدارە ودەزانێ
دەڵێن چی وچیان دەوێ .

روون وئاشکرایە کە هیچ
بەیتێک بەساغی نەگەیوەتە
دەستی ئێمە،ئەوەش دەتوانێ
چەند هۆی هەبێ.

یەکەمیان ئەوەیە کە
بەیت بێژ وانەبووە کە
بەیتێک بەتەواوی مانا
لەبەر بکا وچی بیستووە
فێری بێ وبێ کەموزیاد
بیگێرێتەوە. بەڵکە تەنیا
نێوەرۆکی بەیتەکەی لە
زەینیدا راگرتووە. ئەگەر
زۆر شارەزا بووبێ تەنانەت
قافیەشی گۆڕیوە. بیر وڕا
و بۆچوونی خۆی نێوئاخن
کردووە هەربۆیە لە بەیتی
کۆندا کەرەسەی نوێ وەبەر
چاو دێ. بووێنە زۆربەی
بەیت بێژان تفەنگی بە
چەتاڵ وەشانی سیامەند
دەخەن! کەچی بەپێی
نێوەرۆک و هەل ومەرجی
بەیتەکە، دەبێ سیامەند
خاوەنی تیر وکەوان بووبێ
خوووخدە ورادەی تێگەیشتنی
بەیت بێژ لە دوورەوە بە
بەیتەوە دیارە.

بەیت بێژی دڵتەڕوجوان
پەرست لە هەر جێیەک کە
گەیوەتە باسی یار، ناسک
خەیاڵی گەیاندۆتە ئەوپەڕی
خۆی. "مەحمەڵ"ی بەیت بێژ
حەیران بەو چەشنە
دەڕازێنێتەوە :

" دەڵێم کاکە چەند
خۆشە لەسەری سەفینێ ،
کەپرێکی لەبۆ بەژنی باریک
وئەوێ نازدار حەیرانێ
دروست کەم، دیواری شووشە
بێ ،هەڵاشیگوڵە وەنەوشە
بێ، ئاڵووداری لە گوڵی
دەسوورە گوڵێ بێ، کاریتە
و کوڵەکەی رەشە رێحانە
بێ، گڵەبانی خەنە بێ ،
دەرکە وپەنجەرەی لە داری
بێ، دار مەوتەنێ، نارنج
دەکەم بەخاسەرەنگی، هەموو
شەوونیوەشەوان شیبای شەماڵ
لێی دەدا ، بۆن وبەرامی
دەڕوا بۆسەر ماڵەجیرانان."

یا "دەروێش رەحمانی حەمە
شێت " لەقەتارەدا ئاوا
هەستی دەردەبڕێ :

" بریا کلێک بام کلە
سوبحانێ
پوختەیان کردبام لەکن
لوقمانێ
نازدار بەپەنجەی مبارەکی
کیشابامی دەگۆشەی
چاوەکانی
لەوێشی ببامە فرمێسک
هاتبامەخوار بەپەرێشانی
فەسڵی بای شەماڵ لێی دا
پساندی یەخەی کەتانێ
ئەرێ خۆزێ ئەوێ جارێ
لەسەر سینگەکەی ببام بە
حەوز وکانی
هەچ نەخۆشێک هاتبا سەرم
بە دەردێکی گرانێ
هەڵی کێشابام قەترەیەک
بە ئیستیکانێ
بەڕەزای خودای ببام بە
دەرمانێ ."

# سەید موحەممەد سەمەدی

دۆستی سروە

بەر لە هەموو شتێک بەلازمی دەزانم کە یادێکی بەخێر لە ماموٚستای پایە بەرزی ئەدەبیاتی کوردی، ماموٚستاهێمن بکەم چون پێموایە ئەگەر لە سروەدا شتێک بنووسین یا بڵێین دەبێتە بێ ئەمەگی ئەگەر لەو هۆنەرە پایەبەرزە یاد نەکرێ یاخوا ڕووحی شاد بێ . لە پاشان ڕێزوسڵاوی خۆم پێشکەش بە هەموو کاربەدەستانی ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی وهەموو خوێنەران و هۆگرانی سروە دەکەم. هیوادارم سەرکەوتوو بن وئەو گۆوارە ساوایە لە ئەسەر حەول وتێکوشان و هاوکاری هەموو لایەک ، ڕۆژێک بۆ گوڵەکەمان ببێتە داری بەری .

ئەمن ناوم سەیدموحەممەد شۆرەتم سەمەدی کوڕی سەید مستەفا ولە ڕۆژی سێ شەممۆ چوارەمی مانگی ڕەزبەر ( مهر )ی ساڵی ١٣٢٩ هەتاوی لە گەڕەکی وێنەتان (پشت ئیدارەی دوخانیات)ی مەها— باد چاوم بەدنیا هەڵێناوە. بنەماڵەی ئێمە لە تایفەی شێخەلئیسلامین کە دەچنەوە سەر خودالێخۆشبوو مەلا جامی و لە چەند پشت دوورتر دەگەنەوە سەر پیر خدر شاهۆیی ولەوبارەوە شەجەرە نامەی موەسسەق بەدەستەوە، هەیە.

خوێندنی سەرەتاییم لە مەهاباد دەست پێکرد ولە جۆزەردانی ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی خوێندنی ناوەندیم لە ڕشتەی تەبیعی دا دوایی پێ هێنا. ماوەی دوو ساڵ لە شارەکانی: ورمێ، خانێ سەقز،مەراغە و مەهاباد خەریکی خزمەتی سەربازی بووم ولە ساڵی ١٣٥٢ی ، هەتاوی لە ئامووزیش و پەروەریشی مەهاباد دامەزرام بە شکڵی موکاتەبەیی دەستم بە خوێندنی ڕشتەی حقووق کرد،بەڵام لەدوای ماوەیەک بە چەند هۆ، وازم لە درێژەپێدان بە خوێندنی ئەو ڕشتەیە هێنا وبەجێم هێشت دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک ئەمجار هەر لە تەریقی موکاتیبەوە دەستم کرد بە خوێندنی ڕشتەی زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیسی کە مەسەلەیەکی یەکجار زۆر، مەوریدی عەلاقەی منەوەدەتوانم بڵێم کەهەرگیز لە خوێندن و کارلەسەرکردنی ئەو زمانە نە تێر دەبم نە ماندوو. لە ماوەی کار کردنم لە ئیدارەی فەرهەنگی مەهاباد تا ئەورۆ ئەو شوغڵ و مەسئوولی یەتانەم بووە:

دەفتەرداری،مەسئوولی دەبیرخانەی ئیدارە،یاریدە دەری سەرۆکی ئیدارە،کەفا—

لەتی ئیدارە، بەرپرسی
دەبیرستان،تەدریس،بەرپرسی
دانیشسەرای تەربیەت
موعەللیمی مەهاباد. وهەر
ئێستا بەرپرسی مەدرەسەی
ڕاهنمایی شەهید باهونەری
مەهابادم کە بە شێوەی
" شبانەروزی"ئەو مەدرەسەیە
بەڕێوە دەچێ .

تێکوشانی فەرهەنگی خۆم
لەساڵی ۱۳۵۳ ی هەتاوی را
دەست پێکرد،وباش لەبیرمە
کە هەوەڵین کارم ،
لێکۆڵینەوەیەک بوو لەسەر
کتێبی " پیدایش انسان و
آغاز شهرنشینی" نووسراوی
دوکتۆر یوسف فەزایی. ئەو
لێکۆڵینەوەیەم لە لاپەڕ ی
" نقد وبررسی کتاب "
ڕۆژنامەی ڕەستاخیزدا چاپ
کرا. ئەوجار لەگەڵ گۆواری
(هوخت"مجەللەی زەردوشتیانی
ئێرانی) هاوکاری نێزیکم
هەبووە ولەسەر مەسەلە
کۆمەلایەتی یەکان شتم بۆ
دەنووسین و لەو گۆوارەدا،
بلاو دەبوونەوە.

زۆرتر زەوق وعەلاقەم لەسەر
تاریخە ولەڕشتەی تاریخیشدا
زۆرتر دڵم بۆ تاریخی
کوردستان لێدەدا و پێم
خۆشە لەو بارەوە ئەگەر
خزمەتێکم لەدەست بێ بیکەم.
کۆمەڵناسی وزمان ناسی
دوو ڕشتەی دیکەن کە جار و
بار لەوانیشدا موتالایەکی
دەکەم .

ئەو کارانەی کە تا ئێستا
کردوومن بەتەفکیک هەرکام
لەگەڵ یەک دوو دێڕ ناساندن
بەعەرزوو دەگەیەنم:

الف) بەزمانی کوردی:

۱ـ کۆمارە کوردیەکی ساڵی
۱۹۴۶ ی زایینی(وەرگێڕان)

ئەم کتێبە لە لایەن
ویلیام ئیگلتن جونیرەوە ،
نووسراوە کە لەساڵی ۱۹۶۳ای
زایینی دا لە لایەن بەشی
ئینتیشاراتی دانیشگای
ئاکسفۆڕدەوە چاپ کراوە .
دەتوانم بڵێم کەجامیع ترین
نووسراوە لەبابەت ڕووداوە-
کانی ساڵی ۱۳۲۴ای هەتاوی
مەهابادە کە زۆر بەداخەوە
شێوەی چاپ ونەوعی کاغەز و
جلدی مەتنە کوردی یەکەی
زۆر خراپە. بە نەزەری خۆم
لازمە کە لەسەرڕا جارێکی
دیکە بە ئەو تەرجەمەیەدا
بێمەوە ، چاکی کەمەوە،
جوملەبەندی یەکەی بێنمەوە
حاڵ ، حوروف چینێکی باش
بکرێ ولە کاغەزی چاک
چاپ بکرێتەوە .

۲ـ ژێ.کاف چ بوو ؟
وتووێژ لەگەڵ جەنابی
مەلا قادری مودەڕریسی
یەکێک لە بناغەدانەرەکانی
کۆمەڵەی ژی.کاف کە
بەختەوەرانە ئێستاش هەر
لەحاڵی حەیاتدایە لەکتێبی
" نیشتمان" کە مامۆستا
جەماڵ نەبەز لە ئوڕووپا
بلاوی کردۆتەوە و باسێکی
موفەسسەلی لەبابەت کۆمەڵەی
ژێ.کاف و گۆواری نیشتمان
ئۆرگانی ئەو کۆمەڵەیە ،
نووسیوی وچاپی کردووە
ئیشارەی بەم ریسالە چووکەی
ژێ.کاف چ بوو؟ کردووە و
وای نیشان داوە کە شتێکی
بێ کەڵک نەبووە. لەنێو
خۆمان کە بلاو بۆوە زۆری
هەڵلا لێ پەیدا بوو، هەر
بۆیە ئەمن سەرلەنوێ
چوومەوە خزمەت جەنابی مەلا
قادر وهەموو ئینتیقادەکانم
پێ ڕاگەیاند. ئەویش لوتفی
کرد ودەفتەرچەی یادداشتە-
کانی خۆی کە لەوبارەوە
لەمێژ بوو نووسیبوی لە
ئیختیارنام کە بە فارسی و
بەنێوی " نگاهی دیگر به
ژ.کاف " بلاوم کردەوە.

۳ـ تاپۆ وبوومەلێڵ،یازدە
بەرنامەی ڕادیۆیی وچەند
پارچە شیعری شاعیری
خوالێخۆشبوو سوارەی ئیلخانی
زادە. ئەڵبەت ئەوە لە
تیعدادیکی زۆردا بلاو
نەبۆتەوە.

۴ـ مەقالەیەک لەسەر
دوکتۆر کامران بەدرخان.

۵ـ بیروڕاکانی نێهرۆ.

۶ـ بیرەوەریەکانی
ئارشی ڕۆژوێلت سەبارەت بە
کۆماری مەهاباد.

۷ـ بیۆگرافی یەکی دلشاد
ڕەسوولی (زۆری لێ تەکسیر
نەکراوە).

۸ـ ڕۆژ ژمێری مەهاباد

ساڵی ۱۳۶۲ی هەتاوی(باغەڵی)

۹- رۆژ ژمێری مەهاباد ساڵی ۱۳۶۳ی هەتاوی کە چاپ نەبووە.

تەرجەمەی کتێبی(حیوانات را دستکم نگیرید- اثر عزیزنسین) بەکوردی و بە نێوی: "لە حەیوان سووک مەروانن"- ئەوان بە کەم مەزانن. ئەوکتێبە باشترین ونێزیکترین رێگا بۆ لای خودا وناسینی وی نیشان دەدا، بەڵام لە رێگەیەکی غەیری باس و جەدەلی ئیدئۆلۆژیکی ئەو کتێبە هەمووی بەسەرهاتی سەیر و سەرنج راکێشی حەیواناتە کە ئەفسانە نین و چەندین داستان و سەرگوزەشتەی تازەش لە ناوچەی خۆمانی لێ زیاد کراوە و شتێکە لە نەوعی خۆیدا رەنگە جالب بێت. ئەو کتێبە بە هاوکاری برای بەرێز عەبدوڵڵای سەمەدی تەرجومە کراوە کەئێستا بەیارمەتی دۆستانی خۆشەویستم خەریکە چاپ دەبێ. هیوادارم لە داهاتوویەکی نیزیک دا بە دەستی فەرهەنگدۆستانی خۆشەویست بگا

ب) بە زمانی فارسی:

۱- جمهوری ۱۹۴۶کردستان نوشتە ویلیام ایگلتن جۆنیر.

۲- خودآموز زبان اردو در دو ماه. نوشتە پروفسور عزیزالرحمن.

۳- نقش آقا شیخ و دولت درزندگی اجتماعی و سیاسی کردستان. نوشتە مارتین. وان. برۆنسە. ئەو کتێبە تێزی دەورەی دوکتۆرای ئاغای مارتین. وان. برۆنسە - یە. هەربۆیەش بەزمانێکی زۆر رەق وفەننی نووسراوە. مێژووی دینی، کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردستان لەرۆژگاری سەفەوی را هێناوە تادەگاتە ساڵی ۱۹۷۵ی زایینی ولەوێدا دوایی پێ دێنێ. ئەو کتێبە زیاتر لە هەزار لاپەڕە و ئێستا لە مەسیری ئیزن وەرگرتن بۆچاپ و کاغەز پەیدا کردن و...دایە.

۴- قبایل کردودولت ایران نوشتە مارتین. وان برونسە. ئەوەش لێکۆڵینەوە- یەکە لەسەر بزوتنەوەی سمایل ئاغای سمکۆ.

۵- طوایف وعشایر کرد بە سوورەتی بۆڵتەن لە ۵۰۰ نوسخەدا پۆلی کۆپی کرا و بڵاو بۆوە.

۶- تاریخچە مهاباد. کە ریسالەیەکی کەم و کورتە و ئیتیلاعاتێکی کوللی تێدا هەیە.

۷- مجموعە مقالات دربارە کردستان. دوازدە مەقالەیە حەوتی تەحقیقی و پێنجی کۆمەڵایەتی کە زیاتر لە چوار ساڵە لە ئیختیاری ئینتیشاراتی سەیدیان دا شایەد ئینشائەڵڵا چاپ بکرێ.

۸- نگاهی دیگر بە ژ کاف. بەشکڵی بۆڵتەن و پۆلی کۆپی لە چەند نوسخەدا بڵاو کراوەتەوە.

۹- منظومە کردی حمزە آقا منگور. ئەوەش هەر بە شێوەی بۆڵتەن بڵاو بۆتەوە.

۱۰- یادی از شهیدجاوید استاد عبدالکریم شهریکندی. بە سوورەتی پۆلی کۆپی لە ۱۰۰ دانەدا بڵاو کراوەتەوە.

۱۱- خط مهمترین اختراع بشر. نوشتە دکتر عزیز ژیان. بەسوورەتی پۆلی کۆپی لە ۱۵۰ دانەدا بڵاو کراوەتەوە.

۱۲- بازسازی زبان ترکی نوشتە دیانا سپیرمن، وام نعیم تورفان. باسێکی سەرنج راکێش لە بابەت ئاڵ و گۆڕێکی کە لە تورکیەبەسەر خەت وزمانی تورکی داهاتووە ئەوەش هەر بە سوورەتی پۆلی کۆپی بڵاو کراوەتەوە.

۱۳- مصادر زبان اسپرا- نتو. بەسوورەتی پۆلی کۆپی و لە۵۰۰ نوسخەدا بڵاو بۆتەوە.

۱۴- شرح حال مختصر مولانا قزلجی.

۱۵- کردها نوشتەتوماس بوآ. این کار فعلا" ناقص است.

۱۶- تاریخچە دبیرستان استاد شهید شهریکندی.

۱۷- حجاریهای غار

گندوک درکردستان نوشته روان شاد کلنل توفیق وهبی .

ئەو کارە نیوەچڵانەی کە ئەلعان بەدەستەوەن وخودا دەزانێ کە بۆم تەواو دەبن یان نا :

١ـ گرامر عملی زبان ، کردی،لهجه مکری. نوشته ال .او .فاسوم.ئەو کتێبە لە نەوعی خۆیدا شتێکی کەموێنەیە کە مەتنە ئەسلی یەکەی لە ساڵی ١٩١٦ی زایینی لەنیویۆرک لە چاپ دراوە .

٢ـ هندوئیزم فلسفه و راه زندگی. نوشته سی.راجا گوپالاچاری چاپ ١٩٧٠ بمبی چاپ سوم. ئەو کتێبە لە لایەن یەکێک لە یاران و نێزیکانی مهاتماگاندی ـ یەوە نووسراوە کە خوێندنەوەی ئەو کتێبە دەرکی دنیایەکی نوێ و سەرنج ڕاکێش روو بە فیکری بەشەری دەکاتەوە .

٣ـ تاریخ مهاباد.

تاریخی مەهابادکتێبێکە کە ئەمن بەکاری ئەسلی و دریژخایەنی خۆمم داناوە لە ڕۆژگاری سەفەوی ڕادەستم پێکردووە و ئەگەر خودا بیەوێ تا ئەوڕۆی دێنم . ئەو کتێبە چەند بەشە:

تاریخ اجتماعی، تاریخ سیاسی،تاریخ ادبی، تاریخ فرهنگ وتعلیم و تربیت مشاهیر وبزرگان و ......

ئەڵبەت ئیقرار دەکەم کە ئەوە کاری یەک نەفەر نیە و دەبوو کۆڕێک ئەو کارە بکەن. ئەمما کاتێک دەبینم وا وێ ناچێ کە کەسێک حەوسەلەی ئەو کارەی هەبێ ، خۆ بە مەجبوور دەزانم کە ئەوەندەی لەدەستم دێ بیکەم. تکاشم ئەوەیە کە لە هەر شارە کوردنشینەی یەکێک هەستێ و لەبابەت شارەکەی خۆی کارێکی ئاوا بکا . تا کاتی نووسینی ئەو نامەیە نێزیک چوارسەد لاپەڕەم کۆ کردۆتەوە و دەزانم جارێ کەمە. گەلێکم سەنەد وقەباڵەی قەدیمی دەس خەت ،عەکس و .... خڕ کردۆتەوە. لێرەشدا فورسەت بە غەنیمەت دەزانم و لە هەموو ئەو کەسانەی ئەو نووسراوە دەخوێننەوە تکا دەکەم کۆمەگێکم بکەن، هەر چەشنە سەنەد ،عەکس،قەباڵەی قەدیمی و نووسراوەیان هەیە کە بە نەوعێک پەیوەندی بە تاریخی مەهابادەوە هەبێ یان بەهیمەت یان بە قیمەت یان هەر چلۆنێکی بۆخۆیان بەمەسڵەحەتی دەزانن دەئیختیارمی بنێن هەتا بەنێوی خۆیان کەڵک لەو شتە وەرگرین و تاریخێکی کەمعەیب بتوانین وەدەر خەین .

لەدوایی دا تکایەکم هەیە لە ئەفرادی دەوڵەمەندی وڵاتەکەمان. ئەڵبەت ئەوەی دەی لێم بۆخۆمم نیە ،ئەمن نووسراوەکانم بەهەر چلۆنێک بێ بڵاو دەکەمەوە، وەکی تا ئێستا کردوومە. لەنێو مەدا نووسراوەی یەکجار بەئەرزیش هەیە کەساحیبانی ئەو نووسراوانە لەبەر دەس کورتی بۆیان ناکرێ چاپی کەن وبڵاوی کەنەوە ، حەتتا زۆر نووسراوە لە مەعرەزی لەناوچوون دان . ئەفرادێک لەنێو ئێمەدا هەن کە چەند میلیۆن تمەن پووڵ دەدەن بە کەلاوەیەک و دەیکەنە پاساژ، پووڵی زۆر لەڕێگەی پڕوپوچ خەرج دەکەن یان لەڕێگەی شتی وای خەرج دەکەن کە تەنیا قازانجی ماددی و دنیایی هەیە، ئەوانە گەورەیی بکەن ولە ڕێگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەوئاسەوارانەی کوردی کە وەک گەنجینە وان هەنگاوێک هەڵگرن. ئەو کارە هەم بەهرەی دنیایی تێدا هەم بەهرەی ئاخیرەت ، هەم خزمەتە بە فەرهەنگی گەل ئەوەش هیچ نیازی بە گوتنی من نیە کە فەرهەنگ وزمان وئەدەبیاتبناغەی بوون و ژینی میللەتە و ئەگەر، میللەتێک ئەوانەی نەبێ چی هەیە ؟

## • کورتە باسێک
## • لە باری مێژوو ی
## • شاری
## • شنـــۆ

مارف ئاغایی

شنۆ شارێکی کۆنی کوردە لە کۆنەوە لە زۆزانی ئەو ناوچەیە چادروچیغی کۆچەری کورد هەڵدراوە. دەنگی لاوی کورد لە کێو وڕازورەوەزی دا، زایەڵەی* داوەتەوە. ئاڵ و گۆڕی زۆر قورس-بەسەر ژیانی دانیشتوانی داهاتووە ناوچەیەکیان بەجێ هێشتوە و لە هەوارێکی تر دارچەڵەیان چەقاندووە و چیغیان پێ بەستووە. لەنێو رەهەند* و ئەشکەوتان دا ژیاون،وەدوندی کێوان کەوتوون، لە بناری خۆیان گرتۆتەوە، لە پەنا و پەسیوان مەڵاس بوونە، گەلە کۆمەڵیان لە دوژمن کردووە، ڕایان ناون وهەوراز ونشێوی مێژوویان تێپەڕاندووە. لەو هات وچۆیەدا جارجار لەسەر کێلێژ وتات یادگاریان بەجێ هێشتووە. بەردەنووسی بەوەجیان لەدوا

ماوەتەوە.کەچی ئەو بەردەنووسە نیوە سواوانە، لەنێو ڕەهەندی تاریک دا لەبیر چوونە وبەرەو نەمان دەڕۆن. ئەو گەلانەی خاوەنی پێناسێکی* بەوەجن دەزانن لەکوێ لە دایک بوونە، چۆن ژیاون وپەڕیوەی کوێ بوونە و... بە کورتی پەردەی سەر ڕابردوویان وەلا ناوە ولە دەلاقەیەکی ڕووناک را بەرجەوەندی مێژووی خۆیان دەبینن. بۆ وەدەست هێنانی ئەوبەڵگانە ئەشکەوتیان پشکنیوە، کێل وتاتیان هەڵگێر وەرگێڕ کردووە، دۆڵ وخڕوکێویان پێواوە وتەنانەت زەوی یان هەڵکۆڵیوە وسواڵەتیان لێ وەدەر خستووە.بەڵام ئێمە چی؟ چیمان کردووە؟ ئاسەوار دەبێ لەدوندی کێو چەقی بێ بە خەتێکی خۆش نووسرابن.

وێنەیەکی جوانی لەسەر کێشرابێتەوە واتە بڵیندگۆـ یەکی بەدەست وهاوار بکاو بڵێ من ئاسەوارێکی کۆن و بەوەجم. ئەوجار خەڵک پێ بزانن و چاوەڕوان بن کۆنینەناسێکی دەرەوە بێ و ڕای سپێرن هەتالێکۆڵینەوەی لەسەر بکا!!
دڵنیام ئەگەر کێلەشینیش بەو قەد وقەڵافەتەی لەسەر دوندی کێو نەچەقاندرابا و سەرنجی دیرینەناسان و گەڕۆکانی* دەرەوەی ڕانەکێشابا ئێستاش نەدەناسرا.
لەو باسەدا دەمەوێ سەربە کۆنە ڕەهەندێک هەڵێنین و بزانین لەوێ چ باسە؟

لەسەر چەقی شەقامەڕێی ورمێ،شنۆ (لە ١٨ کیلۆمێتری شار) لە ناوچەیەک بەنێوی عەینەڕۆم ئاوێکی ساف و زولال لە زەوی هەڵدەقوڵێ.

دیمەنی جوانی ئەومەڵبەندە سەرنجی هەموو گەڕۆک و ڕێبوارێک بۆلای خۆی ڕادەکێشێ لە سەرەوەی ئەو کانیانە لەبناری بڵیندایی یەک چەند ڕەهەندی چکۆڵە وەبەرچاو دێن .یەکەمجار ڕابرتدایسین ئەو ڕەهەندانەی چاو پێکەوتووە. لە پاشان لە ساڵی ١٩٧٠ی زایین دا دیرینەناسەکانی ئێران بۆ ئەو مەڵبەندە هاتوون و بەرهەمی لێکۆڵینەوەکەیان لەکتێبێک بەنێوی "گزارش باستان شناسان ایران"دا نووسیوە:

لە ٥۴ کیلۆمێتری باشووری شاری ورمێ لەلای ڕۆژهەڵاتی شەقامە ڕێی ورمێ ، شنۆ ڕەهەندێک وەبەرچاو دەکەوێ. لەو ڕەهەندەدا بەردەنووسێکی ئۆراتویی دیارە کەزۆر کۆنە و سواوەتەوە.سەرنج دانی ئێمە بەو ڕەهەندە بەپێی پێشنیاری"ڕابرتدایسین" بوو ئەو بەردەنووسە لە سەرەوەی کانیاوەکان لەسەر بەردێک هەڵکەوتووە. ئاوی ئەو کانیاوانە زۆر سافوخۆشە. دەوریان سمیت نەکراوە و حەوزیان بۆ ساز نەکراوە. لە نێزیک کانی یەکان دوو بەردی ساف ولووس داندراون ( ئێستا خەڵک بۆ تات کەڵکیان لێ وەردەگرێ).

درێژایی بەردە گەورەکە سەدوشێست وپانایی هەشتا و ئەستوورایی پەنجا سانتی مێترە. لە سافی وڕێک وپێکی بەردەکانڕا وا وێدەچن تاشرابن . لەبەر قورسایی زۆری ئەو بەردانە بۆمان نەلوا، هەڵیان بێنین و بزانین تیشەکاری کراون یا نا؟ لەنێزیک ٥٠٠ مێتری شیمالی ئەو ڕەهەندە لەسەر بەرزایی یەک ئاسەواری چەند ماڵ بەجی ماوە. لەو بەرزایی یە سواڵەتی سەردەمی ئۆراتورمان دۆزیەوە شوێنی دیواری پێکەوەلکاوی دوو ماڵ بەجوانی دیاری دەکرێ .ئاسەواری گوندێکی چکۆڵەی دیکە وقەڵایەک لە باکووری ئەو بڵیندایی یە دیارە. لە شێوەی میعماری ئەو ئاسەوارانەرا پێمان

وابنوو ئیزگای راداری، ئۆراتۆئیان بووه.

ئەو ڕەهەندە لە بەردی کۆنگلۆمەرادا کراوەتەوە. میچەکەی گومبەزی یە بڵیندایی ٢١٦٠ مێترە، پانایی ١/٥٠ مێترە و قووڵایی ٨٠% مێترە. قووڵایی ڕەهەندەکە بەهەڵکەوت کەمو زۆر دەبێ. چونکە تیشەکاری نەکراوە. تەنیا بەشی خواروی ئەو ئەشکەوتە بە قووڵایی ٦٠ سانتی مێتر تاشراوە. دیواری پشتەوەی ئەو حەفرەیە بۆلای سەروو چەماوەتەوە. ئەو بەردە زستانان بەفری لەسەر دەنیشێ وبەهاران دەتوێتەوە ئەو سەهوڵ بەستن وتوانەوە پەیتا پەیتایە بۆتە هۆی ئەوە کە دوو بەش لە سێ بەشی ئەو بەردە هەڵوەرێ و بڕووخێ. ویدەچێ ئەو بەردانەی لەپێش ئەشکەوتەکە کەوتوون خەتی میخی یان لەسەر هەڵکەندرابێ. بەڵام ئەو مەسەلەیە پێویستی بە هەڵکەندن وتۆژینەوە هەیە. (هیوادارم هەتا زۆردرەنگ نەبووە ئەو تۆژینەوەیە بکرێ). لەسەر دیواری پشتی ئەو ئەشکەوتە، لە بەشی خواروی گونبەزەکە ئاسەواری مەتنی میخی بەجێ ماوە (تا ئێستا نەخوێندراوەتەوە) لای چەپی دیوارەکە شەش کونی تێدایە کە جێگای گوللەی تفەنگە. دیارە نیشانەیان لەسەر داکراوە وبەئیشتیا کون کونیان کردووە !!!

لە لای ڕاستی ئەشکەوت و نێزیک بە گونبەزی، میچەکەی وشەی هالدی[2] دەخوێندرێتەوە. هالدی ناوی خێویکە. لە بەشی خواروی پشتەوەی ڕەهەندەکە تەنیا چەند عەلامەتی میخی ساغ ماونەتەوە. ئەوانە لەچوار خەت دان وهەر خەت دەگەڵ خەتەکەی دیکە پێنج سانتی مێتری نێوانە.

دوو بەشی سەتحی دیواری ڕووبەڕوو ساغ ماونەتەوە. ئەوانی دیکە ساوون و خەرا بوونە. بەڵام دیسانیش لەسەر هەر دیوارێک ئاسەوارێک لە حەوت خەت

( تەرحی بێ مقیاس)

١- ویدەچێ ئەو بۆچوونە ڕاست بێ چونکە ئەوە شتێکی ڕوونە کە ئەو ناوچەیە ئۆراتوری لێ بوونە. لەزۆر بەڵگە وکتێبی مێژوویی دا نووسراوە کە ئۆراتوور لە ئازەربایجان و ناوچەی شنۆ ژیاون. بۆ وێنە لەکتێبی "آذربایجان قبل از تاریخ و پس ازآن" نووسراوە: ئۆراتوورەکان لە قەومەکانی زۆر کۆنی ئازەربایجانن و.. لە ئاخرەکانی سەدەی نۆهەمی پێش زایین دا شاری موساسیر- یان گرت. ئەو شارە لەناوچەی پڕ کەندۆکۆسپی جەنووبی ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی (وان) تەقریبەن نێوان ڕەواندوز و شنۆ) بوو. یا لە (مسالک الممالک)دا نووسرا ئۆوراتوورەکان لە سەدەی نۆهەم هەتا حەوتەمی پێش زایین دا لە...وئازەربایجان وقەفقازدا ژیاون.

٢- ئەو هالدیە دەبێ هەمان هالدیە بێ کە لە بەردەنووسی کێلەشینیش دا ناوی نووسراوە. هالدی لە سەدەی نوهەمی پێش زایین دا ناوی دەوڵەتێک بووە لە ناوچەی "وان" کە ئاشووری یەکان ئۆراتووریشیان پێ گوتوون. هەروەها بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە لایەکی بەردی کێلەشین بەزمانی ئۆراتووری نووسراوە.

ئاسەوارەکانی ئەو ڕەهەندەش هەر بەزمانی ئۆراتووری نووسراون.

بە بڵێندایی ٣٦ سانتی میتر دەبیندرێ نەواری نووسراوی لای چەپی دیواری ڕووبەڕوو بە سانایی ناخوێندرێتەوە. ئەو بەردەنووسە هەر چەند تا ڕادەیەک تێک چووە و بەرداشی زەمان سواندویەتی بەڵام زۆر گرینگە ودەبێ سەرنجی پێ بدرێ چونکە لە سەر چەقی شەقامی ریی شنۆ ورمێ هەڵکەوتووە. ئەوە شتێکی ڕوونە کە ئەو ڕەهەندە لەگەڵ ئەوکانیاوە پڕ ئاوانە وئەو جادەیەی بە قەراغی دا ڕۆیوە بێ ڕەبت نەبووە.

لە ١٨ کیلۆمێتری باکووری ئەو ئاسەوارە، ڕەهەندێکی دیکە دیتراوەتەوە میچی گونبەزی یە و دوو حوجرەی کێوی لەنێزیک یەتی. بڵێندایی ٢/٢٠ سانتی مێترە. بەو بەڵگانەی لەڕەهەندی پێشوو وەدەست کەوتوون دەتوانین بڵێین کە ئەو ڕەهەندەش لە سەردەمی ئۆراتوردا ساز کراوە. دیتنەوەی ئەو ئاسەوارانە مەسەلەیەکی گرینگی بۆ ڕوون کردوینەوە ئەویش ڕێگای پەیوەندگرتنی ئۆڕاتوورەکان لەجەنووبی ڕۆژئاوا ورۆژئاوای دەریاچەی ورمێ یە. ئەو ڕێگایە لە درگەیەک ڕا کەپەیکەرەیەکی پادشای منوای لێ یە ( لە سنووری ئێران و عێراق دا هەڵکەوتووە ) دەست پێدەکا و دێتە نەواڵی شنۆیە ولەوێ دەبێ بە چەند لک .یەکیان دەچێ بو قەتڵگا وحەسەنلووو داش تەپە .ولە جەنووبی دەریاچەی ورمێ هەتا ناوچەی لێلان دەڕواتە پێش. ڕێگایەکی دیکە لە شنۆیەڕا دەچێتە لای شومال و لە یەکێک لەبنکە قایمەکانی ئۆڕاتوریان تێ دەپەڕێ دەچێتە ناوچەکانی کێوی و بە ملەیەکی ئارامدا لە ڕەهەندی بەردەنووسەکەتێپەڕ دەبێ و بە نێزیک دوو حوجرە کێویەکاندا دەچێتە دەشتی ورمێ.

لە لای دیکەی ئەو نەواڵە لەسەر تەپکێک ئاسەواری گوندێکی زۆر کۆن دیارە. ئەو ناوچەیە لە سەردەمی ئیسلامدا جارێکی دیکەش ئاوەدان کراوە.

***

لە دە کیلۆمێتری باکووری عەینەڕۆم لە نێزیک گوندی "ڕەشگوند" جێگایەکی بڵێند هەیە کە دیوارەکانی بە بەردی (بلامەلات) تراش بەندی کراون. ئەو بەرزایی یە زۆر کۆنە و دەگەڕێتەوە سەردەمی ئۆراتووری وهەخا ـ مەنشیان. ئاسەواری چەند دیوار و سواڵەتی هەزارەی یەکەمی پێش زایین لەسەر ئەو بەرزایی یە دیارە. لە بەرامبەر ئەو بەرزایی یەدا تەپکەیەکی دیکە سەری وەدەرخستووە کەپێی دەڵێن "کالود". ئاسەواری دیوارێکیش لە خواررووی ئەو بڵێندای یە دیارە. ئەو دیوارە زۆر کۆنە، بەڵام ئێستا دیاری نەکراوە لە چ زەمانێکدا ساز کراوە.

**سەرچاوەکان**

**١- آذربایجان پیش از تاریخ وپس از آن.**

**٢- تحقیقات باستانشناسی ایران**

**٣- مسالک الممالک**

**هەروەها لەو لێکۆڵینەوەی کە ئاغای تەها زادە لەبارەی جوغڕافیای شنۆدا کردبووی لەو بەشەو لەبەشەکانی جۆغڕافیایی دا وەکوو سەرچاوەیەک کەڵک وەرگیراوە.**

لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ئاسەوارانەی شاری شنۆم لەدەستدایە و خوا یاربێ لە داهاتوودا بڵاو دەکرێنەوە:
بەردی کەلی ـ ئەشکەوتی نووسەکان ـ تەپکی قەڵات ـ گردی مەلا ئەحمەد ـ تەپکی دنخە و ئەفسانەی سواری زەرێ.

# زانایانی بەناوبانگی کورد...

مەلا سەعید ئیبراهیمی

زاناونووسەری پایەبەرزی ئێرانی مامۆستا دێهخودا لە فەرهەنگی بەناوبانگی خۆیدا نووسیویەتی "**ئیبنەلحاجب جەمالەدین ئەبوو عومەر عوسمان کوڕی عومەر کوڕی ئەبووبەکر ولەبنەڕەتا ئێرانی ولەنەتەوەی کوردە.** باوکی پەردەداری ئەمیر "**عێزەدین موسک السەلاحی**" بووە. لەولاتی میسر لەدایک بووە ولە شاری قاهیرە وێژە وئەدەبی عەڕەب و فیقهی ئیسلامی خوێندووە و ماوەیەک لە شاری دیمشق دەرسی کوتۆتەوە .وکتێبەکانی بە چەشنێکی روون وئاشکرا نووسراون وبەتایبەت دوو کتێبی "**کافیە**"و"**شافیە**"ی لە هەموو شوێنێکی دونیای ئیسلامدا دەخوێندرێن و ناوبانگیان هەیە وکتێبی "**مختصرالمنتهی**"ئەو نووسەرە بە یەکێک لە کتێبە گرینگەکانی(اصول فقه) لە قەلّەم دراوە ولە پاشان نێوی کتێبەکانی تری دەبا..

"مستەفائەلمەراغی" لە کتێبی "المبین فی طبقات الاصولین" بەرگی دووهەم لاپەڕەی ٦٦ دا نووسیویەتی ئیبنولحاجب لەولاتی میسر لەدایک بووە ولە پاشان چۆتە شاری قاهیرە و لە فێرگەکانی ئەوشارە دەستی کردووە بەخوێندنی قوڕئانی پیرۆز ولە پاشان کتێبی فیقهی لە مەزهەبی ئیمامی مالیک دا و ئەدەبیاتی عەرەبی لەلای پیاوەگەورەکان وزانایانی نێوبەدەرەوەی میسر خوێندووە .

مستەفائەلمەراغی لە درێژەی باسەکەی دا نووسیویە ئیبنولحاجب خزمەتێکی زۆری بەئایینی پیرۆزی ئیسلام کردووە و لە لای خەلک زۆر خۆشەویست وبەرێز بووە و جێی خۆی لەدلّی هەموو زانایەکی دلّسۆزدا کردۆتەوە ولە زانینی "فقە"دا شارەزا بووە وکتێبی زۆری نووسیوە لەزانستی "**اصول الفقە**" دا نێوبانگی بە هەموو شوێن وقاڕەیەکی دونیادا بلاو بۆتەوە ولە**حیکمەت وکەلام** دا دەستێکی بالا و بەهێزی بووە ولە رێز و دەستەی "متکلمین" داندراوە و شاعیرێکی بەرێز لەدەریای زانست دا ومەلەوان بووە.

"**ئیبنی مەهدی لەکتێبەکەی خۆیدا نووسیویەتی** :

"ئیبنولحاجب هەلّکەوتووی زەمان وسەرۆکی زانایانی دەوری خۆی بووەوماموستا ـ یەکی بێ وێنە وبێ هاوتا بووە. لە نووسراوە بەرزەکانیەوە وادەردەکەوێ کە تا پلەیەکی زۆر بەرز هێز ودەسەلاتی نووسین و قەلّەمی بووە.

شێخ شەهابەدین دیمشقی کە بە کوڕی ئەبی شامە- مەشهوورە لەکتێبی "**الذیل**

علی الروضتین" نووسیویە ئیبنولحاجب کۆڵەکەیەکە لە کۆڵەکەکانی دێن و لە زانست وزانیاری وکردەوەداو بە جەوهەر وزانا بووە . لە زانستەکان و حیکمەت وکەلام وفقەو ئوسوول دا، کەس نەیگەیاندۆتە ئەو بەدڵ ودەروونێکی بەتین و پڕ لە خۆشەویستی یەوە ماوەیەکی زۆر لە شاری دیمشق دا لە مەدرەسەی مالیکی دا خەریکی دەرس کوتنەوەی زانیستەکانی ئیسلامی بووە وبە سەدان زانای پایەبەرزی وەکوو **شەهابەددینی قەراخی وقازی ناسرەدین ئیبنی مونیر و قازی ناسرەدین ئەبیاری و ناسرەدین رواوی ... وسەدان زانای تر لە لای ئەو دەرسیان خوێندووە و پێ گەیون .**

ئیبنولحاجب لە دەور و خولی خۆیدا بە زانایەکی پسپۆڕ وهەڵکەوتوو ناسراوە مێژوو نیشانی داوە کە ئەو پیاوە گەورەیە لە دەریای زانست وزانیایی دا گەمیەوانێکی چوست و چالاک وکارامە بووە.ئیبنی خەلە-کان لە لاپەڕەی ۲۱۴ی بەرگی یەکەمی کتێبی "وفیات الاعیان دەڵێ:"من خۆم چەندشیعر و مەبەستی سخت و ئەستەم و موشکیلم لێ پرسی و ئیبنی حاجب بە بیرێکی ورد وهەست و هۆشێکی باشەوە بنەڕەتی ناوەرۆکی مەبەستەکەی وەدەرخست وبە جوانترین شێوە شێ کردەوە ولێکی دەدایەوە و وەڵامی راست ودروستی دەداوە و ئەگەر باسەکە درێژەی نەبا دەمان نووسی .

"زریکلی" و "کەحالە" لەکتێبی مێژوویی خۆیاندا نووسراوە و شوێنەوارەکانی ئیبنولحاجییان بەوجۆرە ناو بردووە"کافیە" لەزانستی نەحودا "شافیە" لە زانستی سەرف دا چ"جامع الامهات" لەفیقهی ئیمام مالیک دا "المقصدالجلیل" لە عیلمی عەرووزدا "الامالی النحویه" "منتهی السؤل والامل فی علم الاصول والجدل" لەزانستی ئوسوولی "فقه"دا . "مختصرمنتهی السول والامل " الایضاح" .

مەحموودی شەهابی ماموستای زانکۆی حقووقی زانستگاکانی تاران لە لاپەڕەی ۳۶ ی تەقریراتی ئوسوول دا نووسیویەتی ئیبنوالحاجب ئەبوو عومەر وعوسمان ئیبنن وعومەر کوردی باوکی لە تایفەی کورد بووە.لە لەشکریانی ئەمیرعێزەدین سەلاحی و پەردەداری ئەو بووە. هەر بەو هۆیەوە بەئیبنولحاجب نێوبانگی دەرکردووە ولە ماموستایانی گەورەی ئەدەب و لەزانایانی پایەبەرز و نێویەدەرەوەی نەحو وسەرف ووێژەی عەرەب بووە .

کتێبی قافیەی ئەوبەتایبەت لەگەڵ شەرحی کە فەیلەسوفی زانستی نەحو ماموستا"نجم الائمەرضی ئوسترئابادی" لە سەری نووسیویە بۆ داوخوازانی نەحو بەسە و کافیە. وکتێبی " شافیە" زانستی سەرف و وردەکاری و جوانکاری یەکی زۆری تێدایە ووافیە وکتێبی " مختصر منتهی" لەعیلمی ئوسوول دا زانایان ولێکوڵێنەران سوودی زۆریان لێگرتووە و هەر لەو کتێبەدا ئوستاد شەهابی لە لاپەڕەی ۱۵۶دا نووسیویەتی "موختەسەری حاجیبی" چەند سەدە جێگای سەرنج بووە وزانایی شیعە پەراوێز وتەعلیقێکیان لەسەر نووسیوە وبەدەرس کوتوویانە کەحالە نووسیویەتی لە کۆتایی ساڵی ۵۷۰ لە وڵاتی میسر لەدایک بووەو لە شەووالی ساڵی ۶۴۶ لەشاری ئەسکەندەری یەی میسر کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ ساڵح ئەبی ئەسمە بەخاک سپێراوە .

**سمایل پیران**

**تەنزی کۆمەڵایەتی**

ڕۆژێکی هەینی مانگی گەلاوێژ بوو، بەدوای سەر- خەوێکی دوانیوەڕۆ هەستام و هێندێک خۆم لەبەریەک کێشاوەو یەک دوو باوێشکم هاتێ. بە لەشێکی گران و چاوانی خەواڵوو دوو سێ لۆچم ئاو بە دەم وچاوان داکرد. زۆرم ئیشتیا لە چا بوو، کەتری یەکەم وەسەر نا ولە جێگای خۆم دانیشتم چی وای پێ نەچوو کەتری وەهازە،هاز کەوت. نازانم ئاوەکە وەکوڵ هاتبوو یا نا،بەڵام چەند ئیسکانێکم دێم کرد وپاش چاخواردنەوە کەتری وچایدانەکەم وەلا نا وبێ تۆ ناخۆش جغارەیەکی ئوشنۆویژەم دە مۆدنەکە ناو دامگیرساند. بەڵام هەر لەلای خۆمان بێ ئەو هەموو حەول ودەولەم هەر بۆ جغارەکە بوو.ئەویشم بەئاخر گەیاند ئەگەر بڵێم تۆزێک حاڵم هاتەوە سەرخۆ درۆیە.وەڵڵاهی وەک تۆپێم لێهات. ئەوجار دڵم بۆماڵی مامم کەوتە گاڵەگاڵ. ئاخر ئامۆژنم چەندە بڵێی تێگەیشتوو بەسەبرە. جا ئەگەر بەڵێنی ئەوەشت پێ بدا کە بۆت بچێتە خوازبێنی کچی هاوسێیان مەپرسە چەند عاقڵ وئینسان دێتە بەرچاو! کلۆڵی وەک منیش سێبوری بەو نەبێ بەکەس نایە. دێیەکەشیان زۆر لە شاری دوور نەبوو. ڕێگاکەشی تازە قیلەتاو کرابوو و هاتوو چۆش بەڕێگەی قیلەتاودا هەتا بڵێی خۆشە.

هەستام کەواوپاتۆڵەکەم دەبەر کرد و پشتێندم لێ بەست و بەبۆنەی چوونە ماڵە مامم دەرگاوبانم داخست و وەدەرکەوتم.

هەرکە لە حەساری وەدەرکەوتم چاوم بە قوڕو چڵپاوی کۆڵانەکەمان کەوت. ڕیخ وپەینم پێ باشتر بوو. بەخۆم دەگوت باش نیە ڕیخ وپەین ئەگەر پیسیش بێ قازانجی هەیە، بەلام قوڕوچڵپاو ئەتۆ چی؟ لەو قسانەدا بووم کە کوڕە، هاوسێکەی دوو دەرگا ئەولا -ترمان کوچکە بەردێکی لە قوڕوچڵپاوەکە هاویشت و لایەکی پاتۆڵەکەمی قوڕاوی کرد. ئەوجار هێندەی دی هەترەشم چوو. وام لێ هاتبوو ڕاستبچمە بۆنگای کڕین وفرۆشتنی موڵک و سامان وخانووبەرەکەم بفرۆشم بەڵام هەرووەک گوتم هەینی بوو وهەموو جێ یەک داخرا بوو. ئەوەشم لەدڵی خۆمدا ڕاگرت کە ئەگەر ئێوارەیەک یا شەوێک لەجێیەک کۆ بووینەوە بە چەشنێک بە بابەکەی ڕابگەیەنم وبڵێم برا خۆ منداڵ ڕاهێنان بەمشێوەیە نابێ!

هەرچۆنێک بوو لە کۆڵان دەرباز بوو وخۆم گەیاندە نێو شەقام. لایەکی شەقامەکە هەڵکەندرابوو تەنانەت فیلیشی لێ دەرنەدە- چوو چ بگا بە منی بێ هێزی بەستەزمان! لە لایەکەی دی ئامێری* قیلەتاو کاری دەکرد وبۆوەی نەدەبوو بۆ لاشی بچی. بۆنی بۆتکەی* مریشک فرۆشان و تەقە تەقی ئاسنی وەستاعەلی ودووکەڵی حەمامی شەهرەداری ئینسانی هێندەی دی لەخۆ جاڕز دەکرد: بە ڕق و گازندە* وە پشتم تێکردن.شەقام وکۆڵانەکانی شارم پێوا و چوومە دەرەوەی شار. گوتم ئۆخەی خۆ ئەگەر بۆ سەعاتێکیش بێ لەو هەڵڵا وبگرە خەڵاسیم هات

لە دەرەوەی شار لە جادەی دێ ڕاوەستام، ماشێنی جۆراوجۆر لە هاتوچۆ دابوون

هێندە جوان بوون کەوێنەیان لە نوێنگەی تارانیش نەدیتراون. جارجاریش هی وام دەدیتن بەخۆم نەبوو پێکەنین دایدەگرتم، من درێژەم بە هەودای خەیاڵ دەداو ماشێنە-کانیش بە تەنیشتمدا ڕادەبردن ئەوەندەی پێ نەچووماشێنێک هات وتیژ تێپەڕی جارێ هەتا نەگەیشتە نێزیکی خۆم هەر نەمزانی ماشێنیش دێ کە ئەو دیمەنەم دی بەزەییم بەخۆم هات ،پێی ڕۆیشتنم نەما وگوتم خودایە نەخشت چەند جوانە .

چیتان لێ وەشێرم ئێوەش هەر هی خۆمانن .پازدەتمەن زیاترم لە گیرفاندا شک نەدەبرد، دەستم بۆ چەند ماشێن هەڵێنا بۆیان ڕانەگرتم لە حەیفان دەتمەنێکم لە گیرفان دەرێنا و وەک دەسماڵی سەرچۆپی کێش ڕام دەوەشاند. دەمگوت وەڵڵاهی ئەگەر وانێت باری ماڵاتیش بێ بەو شەرتە بۆم ڕاگرێ سواری دەبم. لەو بیرانەدا بووم کە مینی بووسەکەی کەریمخانی وەک قەتارە توندڕەوەکانی ژاپۆنی لەناو مێشە وداڕستانەکاندا سەری وەدەرنا ،لەخۆشیان شاگەشکە بووم، باوەر کەن زاوای پێنج شەممۆی گوێسوانەی بانی ئەوەندە خۆشحاڵ نەبوو!! بە پەلە دەرکەم کردەوە، ئەگەرنایەک دوو زەلام بەسەریەکدا کەوتنە خوار وەختابوو زەندەقم بچێ . ئەوەی هەرە زەلام خۆی لێ ڕاست وچۆپ کردم وگوتی:

- شەیتان دەڵێ زللەیەکی لێدە هەردوو چاوی لە پاشکەسەری وەدەرنێ ؟ ئاخر فیتفیتە ئەوە کار بوو ئەتۆ کردت ؟"

لەپڕ سەرشانی گرتم و دوو سێ جار ڕای وەشاندم. لەترسان وەک مێوژۆکە دەلەرزیم. ئەوانەی نێو ماشێنەکە بەزەییان پێمدا هات وگوتیان :

- دەی عەولا قەیدی ناکا خۆ شوکر چ نەبووە! "

عەولا بە تووڕەیی یەوە سواری ماشێن بووەو ئەمنیش پشوویەکم هاتەوە بەرخۆ . سواری ماشێن بووم، جا چ سوار بم زیاتر لە ۴۹ نەفەری تێدابوو. قیژو هۆڕێک بوو باب ئاگای لە کوڕ نەبوو.

منی کزی ماڵ ویران کە بەزەحمەت خۆم دە ژووری ، پەستیبوو خۆم بە پاڵپشتی سەندەڵی شۆفێر قایم کردبوو هێندەم فشار بۆ هاتبوو ملم دەتگوت سەرە کیسەڵە لە قالبەکەی هاتۆتە دەرێ . تەپ ودووکەڵی جغارە و بۆنی کەوش وگۆریە وچڵک و ئارەقە ڕێچکەیان گرتبوو و هەراهەرای خەڵکەکەش شایی یەکەی دەگێڕا. تەگەری مینی بوس هێشتا دووسەد دەور نەخولابوو کە کەریم خان پێی لەسەر تۆرمز دانا و دەرکەیان بەسەد ناری عەلی کردەوە. پیاوێک هاتە خوار و دوو سێ ژنیان پاڵەستودا ژووری. وەکوو قاز هەرجارێ پێیەکم هەڵدێنا ویەکم دادەنا. لە دێی پێشەوە دوو سێ نەفەر هاتنەخوار. کاتێک پێی چۆپەم دانا عەرزی جێی پێم زۆر نەرم بوو وامزانی تاخوریە. هەر ئەوەندەم گوێ لێ بوو کە مستەفای حاجی دووقودوولە هەرای کرد :

-" پوورە رابی ئەو کابرایە مریشکەکەتی کوشت!

پوورەڕابی چاوی ئووقاند و زاری کردەوە وگوتی:

- هەی چرچەی مل دەنکە شەمچە کوێری ؟ ئەومرێشکەت نەدیوە ؟

زارم بەبرین چێ....

گوتم وەڵڵاهی پوورێ گیان مریشکم دیوە بەڵام ئەوەم نەدیبوو کە مریشک لە شاری ڕا بەرنە دێ!!

- بۆ هەر ئێوەی شارەیی ئینسانن وئێمەی گوندی چ نەزان ؟

- ئەستەغفیرەڵڵا پوورێ گیان کێ وای گوتووە !!

سەرەڕای ئەو هەموو دمەقاڵەیە لەوە دەترسام پێم ببژێرێ. لە ڕووی، ناعیلاجی کورتم دەکێشا و

لەدڵی خۆمدا ئایەتەلکورسیم دەخوێند. لەپڕ خێرخودایەک هەرای کرد:

-"رابی ئەوە ئەوەندەی نایەنێ بە چەندیت کڕیوە با پووڵەکەت بداتەوە! بە بیستنی ئەو قسەیە هێندەی نەمابوو بەندی دڵم بپسێ. ئاخر ئەو هەموو حەول و دەولەم بۆ وەبوو پووڵی نەدەم. پوورەڕابی مەرامی بوو پووڵەکەیم پێ ببژێرێ وئەمنیش ملم نەدەدایە. ئاخر لە پازدەتمەن زیاترم پێ نەبوو. پێنج تمەنم دا کرێی ماشێن وپێنج تمەنیش لەکاتی سواربوون دا لێم ون بوو و تەنیا مابوو پێنج تمەن.

بەگوتەی پوورە ڕابی قیمەتی مریشکەکە سەدونەوەد وپێنج تمەنە. ئەوە پێنج تمەنەکە، ئەدی ۱۹۰ تمەنەکەی دی لەکوێ بێنم؟! دەگ ماڵت خرابێ مامە دەگەڵ ڕێی بۆت دیتمەوە. دەترسام بڵێم هەر پێنج تمەنم هەیە، لەدڵی خۆمدا گوتم واچاکە ئەوجارەش دڵ لە دەریا دەم وپیاوەتێکی بنوێنم وبڵێم باشە پوورێ گیان ئەگەر گەڕامەوە شار مریشکێکی لە هی خۆت باشتر بۆ دەکڕمەوە. زمانی سووتاوی خۆم وەکار خست وگوتم:

- پوورێ هەرچی ئەتۆ گوتت ڕاستە بەڵام شەرت بێ ئەگەر گەڕامەوە مریشکێکی زۆر باشترت بۆ بکڕمەوە.

پوورە ڕابی زۆر بە هێمنی گوتی:

- ناوەڵڵا ئەگەر ڕاست دەکەی وپیاوێکی باشی سەد وپەنجا تمەنەکەم دەیە و چل وپێنج تمەنەکەشی بە قوربانی تۆ بێ.

موچڕکێک بەسەرتاپێی لەشم داهەڵگەڕا! خودایە چ بکەم. ئەگەر بڵێم نیمە دەڵێ ئەدی پیاوی باش ئەو شەکرەت بۆ دەشکاند ؟!. ئەگەر بڵێم باشە، ۱۴۵ تمەنەکە لەکوێ بێنم؟!.

لەو خەیاڵانەدا بووم کە ماشێنەکە پەنچەر بوو. لە ماشێن هاتینەخوار لەجۆگەی قەراخ ڕێ تێرم ئاو خواردەوە و دەموچاوم شوشتن وبڕێک هۆشم هاتەوە سەرخۆ. لە فکری ئەوەدا بووم بە هەر شێوەیەک بێ خۆ لەو هەرا وبگرە ڕزگار کەم، هەر ئەوەندەم دی ماشێنی کورە خاڵی دایکم گەیشتە جێ و سەری لە ماشێن وەدەرخست و گوتی:

- ئەوە لێرە چ دەکەی؟

- بۆخۆشم نازانم!

- وەرە دانیشەبگەڕێینەوە شار کارم پێتە!

- لکی پشتێندەکەم کە چاوم پێ وشک کردبووە، دەبەر پشتم ڕۆکردەوە و چاوێکم گێڕا و سوار بووم و گەڕامەوە شار. بەڵێنیمدا تا ئەمن هەم هیچ نیوەڕۆیەک بیری چوونە دەر نەکەمەوە.

ئەرێ بڵێی ئێستا پوورە ڕابێ چی کردبێ؟

بڵێی هەر چاوەنواری من نەبێ مریشکی بۆبەرم...؟

هێندە جوان بوون کەوێنەیان لە نوێنگەی تارانیش نەدیتراون. جارجاریش هی وام دەدیتن بەخۆم نەبوو پێکەنین دایدەگرتم، من درێژەم بە هەودای خەیاڵ دەداو ماشێنەکانیش بە تەنیشتمدا رادەبردن ئەوەندەی پێ نەچوو ماشێنێک هات وتیژ تێپەری جارێ هەتا نەگەیشتە نێزیکی خۆم هەر نەمزانی ماشێنیش دێ کە ئەو دیمەنەم دی بەزەییم بەخۆم هات ،پێی رۆیشتنم نەما وگوتم خودایە نەخشت چەند جوانە .

چیتان لێ وەشێرم ئێوەش هەر هی خۆمانن .پازدەتمەن زیاترم لە گیرفاندا شک نەدەبرد، دەستم بۆ چەند ماشێن هەڵێنا بۆیان رانەگرتم لە حەیفان دەتمەنێکم لە گیرفان دەرێنا و وەک دەسماڵی سەرچۆپی کێش رام دەوەشاند. دەمگوت وەڵڵاهی ئەگەر وانێت باری ماڵاتیش بۆ بەو شەرتە بۆم راگرێ سواری دەبم. لەو بیرانەدا بووم کە مینی بووسەکەی کەریمخانی وەک قەتارە توندرەوەکانی ژاپۆنی لەناو مێشە ودارستانەکاندا سەری وەدەرنا ،لەخۆشیان شاگەشکە بووم، باوەر کەن زاوای پێنج شەممۆی گوێسوانەی بانی ئەوەندە خۆشحاڵ نەبووا! بە پەلە دەرکەم کردەوە، ئەگەر نایەک دوو زەلام بەسەریەکدا کەوتنە خوار وەختابوو زەندەقم بچێ . ئەوەی هەرە زەلام خۆی لێ راست وچۆپ کردم وگوتی:

- شەیتان دەڵێ زللەیەکی لێدە هەردوو چاوی لە پاشکەسەری وەدەرنێ ؟ ئاخر فیتفیتە ئەوە کار بوو ئەتۆ کردت ؟"

لەپر سەرشانی گرتم و دوو سێ جار رای وەشاندم. لەترسان وەک مێوژۆکە دەلەرزیم. ئەوانەی نێو ماشێنەکە بەزەییان پێمدا هات وگوتیان :

- دەی عەولا قەیدی ناکا خۆ شوکر چ نەبووە! "

عەولا بە تووڕەیی یەوە سواری ماشێن بووەو ئەمنیش پشوویەکم هاتەوە بەرخۆ . سواری ماشێن بووم، جا چ سوار بم زیاتر لە ۴۹ نەفەری تێدابوو. قیژو هۆرێک بوو باب ئاگای لە کور نەبوو.

منی کزی ماڵ ویران کە بەزەحمەت خۆم دە ژوورێ ، پەستیبوو خۆم بە پاڵپشتی سەندەڵی شۆفێر قایم کردبوو هێندەم فشار بۆ هاتبوو ملم دەتگوت سەرە کیسەڵە لە قالبەکەی هاتۆتە دەرێ . تەپ ودووکەڵی جغارە و بۆنی کەوش وگۆریە وچڵک و ئارەقە رێچکەیان گرتبوو و هەراهەرای خەڵکەکەش شایی یەکەی دەگێرا . تەگەری مینی بوس هێشتا دووسەد دەور نەخولابوو کە کەریم خان پێی لەسەر تۆرمز دانا و دەرکەیان بەسەد ناری عەلی کردەوە. پیاوێک هاتە خوار و دوو سێ ژنیان پاڵەستودا ژوورێ. وەکوو قاز هەرجارێ پێیەکم هەڵدینا ویەکم دادەنا . لە دێی پێشەوە دوو سێ نەفەر هاتنەخوار. کاتێک پێی چۆپەم دانا عەرزی جێی پێم زۆر نەرم بوو وامزانی تاخوریە. هەر ئەوەندەم گوێ لێ بوو کە مستەفای حاجی دووقودوولە هەرای کرد:

-" پوورە رابی ئەو کابرایە مریشکەکەتی کوشت!

پوورەرابی چاوی مووقاند و زاری کردەوە وگوتی:

- هەی چرچەی مل دەنکە شەمچە کوێری ؟ ئەومرێشکەت نەدیوە ؟

زارم بەبرین چێ....

گوتم وەڵڵاهی پوورێ گیان مریشکم دیوە بەڵام ئەوەم نەدیبوو کە مریشک لە شاری را بەرنە دێ!!

- بۆ هەر ئێوەی شارەیی ئینسانن وئێمەی گوندی چ نەزانن ؟

- ئەستەغفیرەڵڵا پوورێ گیان کێ وای گوتووە!!

سەرەرای ئەو هەموو دمەقاڵەیە لەوە دەترسام پێم ببژێرێ. لە رووی ، ناعیلاجی کورتم دەکێشا و

لەدڵی خۆمدا ئایەتەلکورسیم دەخوێند. لەپڕ خێرخودایەک هەرای کرد:

-" رابی ئەوە ئەوەندەی نایەنێ بە چەندیت کڕیوە با پووڵەکەت بداتەوە! بە بیستنی ئەو قسەیە هێندەی نەمابوو بەندی دڵم بپسێ. ئاخر ئەو هەموو حەول و دەولەم بۆ وەبوو پووڵی نەدەم. پوورەڕابی مەرامی بوو پووڵەکەیم پێ ببژێرێ وئەمنیش ملم نەدەدایە. ئاخر لە پازدەتمەن زیاترم پێ نەبوو. پێنج تمەنم دا کرێی ماشێن وپێنج تمەنیش لەکاتی سواربوون دا لێم ون بوو و تەنیا مابوو پێنج تمەن.

بەگوتەی پوورە ڕابی قیمەتی مریشکەکە سەدونەوەد وپێنج تمەنە. ئەوە پێنج تمەنەکە، ئەدی ١٩٠ تمەنەکەی دی لەکوێ بێنم؟! دەگ ماڵت خرابێ مامە دەگەڵ ڕێی بۆت دیتمەوە. دەترسام بڵێم هەر پێنج تمەنم هەیە، لەدڵی خۆمدا گوتم واچاکە ئەوجارەش دڵ لە دەریا دەم وپیاوەتێکی بنوێنم وبڵێم باشە پوورێ گیان ئەگەر گەڕامەوە شار مریشکێکی لە هی خۆت باشتر بۆ دەکڕمەوە. زمانی سووتاوی خۆم وەکار خست وگوتم:

- پوورێ هەرچی ئەتۆ گوتت ڕاستە بەڵام شەرت بێ ئەگەر گەڕامەوە مریشکێکی زۆر باشترت بۆ بکڕمەوە.

پوورە ڕابی زۆر بە هێمنی گوتی:

- ناوەڵڵا ئەگەر ڕاست دەکەی وپیاوێکی باشی سەد وپەنجا تمەنەکەم دەیە و چل وپێنج تمەنەکەشی بە قوربانی تۆ بێ.

موچڕکێک بەسەرتاپێی لەشم داهەڵگەڕا! خودایە چ بکەم. ئەگەر بڵێم نیمە دەڵێ ئەدی پیاوی بناش

ئەو شەکرەت بۆ دەشکاند ؟!. ئەگەر بڵێم باشە، ١٤٥ تمەنەکە لەکوێ بێنم؟!.

لەو خەیالانەدا بووم کە ماشێنەکە پەنچەر بوو. لە ماشێن هاتینەخوار لەجۆگەی قەراخ ڕێ تێرم ئاو خواردەوە و دەموچاوم شوشتن وبڕێک هۆشم هاتەوە سەرخۆ. لە فکری ئەوەدا بووم بە هەر شێوەیەک بێ خۆ لەو هەرا وبگرە ڕزگار کەم، هەر ئەوەندەم دی ماشێنی کورە خالی دایکم گەیشتە جێ و سەری لە ماشێن وەدەرخست و گوتی:

- ئەوە لێرە چ دەکەی؟

- بۆخۆشم نازانم!

- وەرە دانیشەبگەڕێینەوە شار کارم پێتە!

- لکی پشتێندەکەم کە چاوم پێ وشک کردبووە، دەبەر پشتم ڕۆکردەوە و چاوێکم گێڕا و سوار بووم و گەڕامەوە شار. بەڵێنیمدا تا ئەمن هەم هیچ نیوەڕۆیەک بیری چوونە دەر نەکەمەوە.

ئەرێ بڵێی ئێستا پوورە ڕابێ چی کردبێ ؟

بڵێی هەر چاوەنواری من نەبێ مریشکی بۆبەرم...؟

بەشی یەکەمی وتووێژ لەگەڵ ڕاوچی یەکی بەناوبانگ بەناوی مستەفا مەحموود زادەمان بڵاو کردەوە. ئێستاش درێژەی ئەم باسە بەناوی راوە کەو پێشکەشی خوێنەرانی بەرێز دەکەین .

تا ئێستا ڕاو بەزۆر شێوە باسی لێ کراوە بەڵام شێوازی ڕاوی ئەمڕاوچی یە و ڕا و بۆچوونی ئەو لەسەر ڕاو باسێکی نوێ یە. بۆیە سەرنجی خوێنەرانی بەرێز بۆ ئەم وتووێژە ڕادەکێشین و داوا دەکەین ئەگەر ڕاوچی وا شارەزایان پێ شک دێ وئێمە نایانناسین بۆمان بنووسن و ناونیشانی ئەوانمان پێ بڵێن تا بچین بیاندوێنین و بیانناسێنین .

- بەر لە هەموو شت دەبێ کورتە مێژووی ڕاوە کەو لە کوردستاندا باس بکەی! بەم شێوەیە کە فەلسەفەکەی چیە و لە فۆلکلۆردا بۆ ئەوەندە باسی ئەو ڕاوە کراوە و بۆچی خەڵک ئەوەندە ڕاوە کەویان پێخۆشە ؟

- بۆ جارێکی دیکەش سپاسی سروە دەکەم کە ئەوەندە بە فەرهەنگ و داب ورەسمی کۆن و نوێی کوردەواری یەوە ماندووە . دوایە دەبێ لە بابەت پرسیارەکەت یا باشتر بڵێم پرسیارەکانتدا بڵێم کە :

کوردستان مەڵبەندێکی شاخاوی یە. دیمەن و تاڤگەی جوانی هەیە. کەویش دڵبەندی ئەمجۆرە جێگایانەیە و لە جێی وا دەژی یانی هەریمی ژیانی کەو مەڵبەندی کوردستانە. لە لایەکی دیکەشەوە کەو فڕندەیەکی جوان وخۆش خەت و خاڵە وجیلوەیەکی جوانی هەیە و زووش دەستەمۆ دەبێ . بە کوردی کەو لە قەدیمەوە لە ژیانی کوردەواریدابووە وئەویش لەبەر جوانی وگۆشت ودەنگ ڕاوی کردووە.

- ئەڵبەت زۆر پرسیار لەم نێوەدا دێتەگۆڕ بەڵام بۆ دوایەی هەڵدەگرین و جارێ لەبارەی مێژووی چۆنەتی ڕاوە کەو پرسیار دەکەین. ڕاوە کەو لە سەرەتاوە تا ئێستا چۆن بووە ؟

- ئەوە باسێکی دوورو درێژە و تەنیا دەتوانم بە کورتی چەند شێوە ڕاوتان بۆ باس بکەم .

قەدیم چەکی مودێرن نەبووە تەنیا چەکی ڕاو شەمشیر وتیروکەوان بووە و هێندێکیش پلار و گۆچانیان

پێ بووە. کەو بەم جۆرە چەکانە ڕاو ناکرێ و ئەگەریش بکرێ زۆر چەتوونە. جا بۆیە هاتوون تەگبیرێکی نوێ یان لەحاڵی خۆیان کردوتەوە وداویان ناوەتەوە تەبعەن کوردستان ئەسپی زۆر بووە و بە مرووری زەمان قایمبوونی مووی کلکی ئەسپیان بۆ سەلماوەو داویان پێ چا کردووە. خۆ ئەودەم سنعەت نەبووە تا لە نایلۆن و سیم کەڵک وەربگرن. مووی ئەسپیان دەرکێشاوە و هۆندوویانە-تەوە وداویان پێ چا کردووە ولەو شوێنانەی شکیان بۆچووە ناویانەتەوەو کەو بە لاق وئەستۆ پێوەی بووە بەڵام ئێستا ئەم شێوە ڕاوە قەدەغە کراوە.

لەپاشان بەتەجرەبە چەشنە داوێکی دیکەیان ناوەتەوە وبەم شێوە کە ماکەویان لە قەفەس کردووەو زانیویانە نێرە کەو دەنگی دەبیسێ و هەستی پێدەکا ووەشوێنی دەکەوێ. جا دەهاتن لەپێش ڕکە داویان دەناوە و نێرەکەو پێوەی دەبوو. ئەم ڕاوە تایبەتی بەهار بوو.

دوایە هاتن لە داوی چاکتر کەڵکیان وەرگرت و تۆڕیان پێ ساز کرد. یانی دانیان لە شوێنی تایبەتی لەسەر تورەکە ڕۆ دەکرد و بە چیلکەوچاڵ دایاندەپۆشی و لە جی یەکی دوور مات دەبوون. کەو دەهاتن دانە بخۆن ڕاوچی تۆڕیان دەکێشا و کەو لەوێدا دەمانەوە ئەڵبەت دەبوو دوو سێ ڕۆژ پێش هەروا دانی پێوەرکەن بۆ ئەوە کەو دانەخۆرە بێ وپاشان داویان بۆ دەناوە جا واهەبوو هەموو پێوە دەبوون وواش هەبوو دەستەیەک دەفرین وپۆلێک لە داو دەکەوتن. ئەمجۆرە ڕاوەش ئێستا قەدەغە کراوە

لە پاشان ڕاوێکی دیکە وەدەرکەوت کە تەپکەی پێ دەڵێن. دوو تەختەی ناسک وەکوو چوارچێوەی دار بە مووی ئەسپ لێک دەبەستن و عەرزی بۆ هەڵدەکۆڵن ولە ژێر خۆڵێکی سووک حاشاری دەدەن. مەودای نێوان دوو تەختەکە ٦٠ تا ٧٠ سانتی مێترە ئەویش بۆئەوەیە کە بارستی* خوڵەکە تەختەکان وێک نەیەنی. بەم شێوەش کەو ڕاو کراوە.

زۆر شێوەی دیکەش بۆ ڕاوەکەو هەبوون کە ئێستا قەدەغە کراون.

ئێنجا دێینە سەر ڕاوە تفەنگ. لەپێشدا ڕاو بە تفەنگی سەرپڕ دەکرا کەبە باڕووتی ڕەش دەیان ئاخنی ئەویش ئەوەندەی توانا نەبوو لە حەوا بنگێوێ و ڕاوچیش زۆر بەڵەد نەبوو لە لایەکی دیکەوە ئەگەر مەودا زۆر با نەیدەگەیشتێ. نێزیکیش با کەو دەیبێنی. بۆ چارەی ئەم کارەش هاتن دێوجامە*یان ساز کرد.

دێوجامە چۆن بوو؟

- دێوجامە پارچەی خامی سپی بوو. مێترێک لە مێترونیوێک دا بوو. لە پارچە وشتی دیکە شکڵی حەیوان ومار وشتی وایان

لێ چا دەکرد وشتی سوورو شین وزەردیان پێوە هەڵداوەسی. دوو کونیان تێدەکرد یەک بۆ لوولەی تفەنگ یەک بۆ چاوی ڕاوچی. دوایە لە دارێکیان دەدرووو دەچوون لە پەنا بەردێک خۆیان دەشاردەوە. هەر کە کەو دەهاتن بە دیتنی ئەم شتانە قوشقی* دەبوون ولێی دەچوونە پێش. ڕاوچی رادەوەستا تا نێزیک دەبوونەوە، دوایە تفەنگی ئاگر دەدا و دووسێ یەکی دەخستن. بەڵام ئەم کارەش چون فێڵی تێدایە قەدەغە کراوە.

لە سەدەی بیستەمدا فیکری بەشەر تەنەوەی* کردووە باڕووت و چەکی تازە هاتوتەگۆڕ ولەباری سنعەتەوە وەپێش کەوتووین بەڵام لەباری تەفریحی سالمەوە نا سیاسەتی چەوسێنەری و کولەداری تەفریحی ناسالمی وەباو خست و بوو بە کۆسپی سەر ڕێی هەموو چەشنە تەفریحی سالم.

ئەمجار بە چەکی کاری تەیار بووین و ڕاوێکی تەنیا بۆ سەرگەرمی وخافڵان بوو، جێی خۆی دا بە موسابەقەی باڵندە و حەیوان کوشتن. ئیدی ئێستا کەمتر خەڵک بۆ هەڵمشتنی هەوای ژیانەری کوێستان و گوێ هەڵخستن بۆ قاسپەی کەو وخواردنەوەی قومێک ساردا وی کانی دەچێتە ڕاو.

- بەبڕوای تۆ فەسڵی ڕاوە کەو کەنگی یە ؟

- وەختێک بتوانێ هەڵفرێ. فەرخە نەبێ. دەنا ئەم ڕاوچی یە گورگە گورگ وەختێک دیتی دەعبایەک ناتوانێ هەڵفرێ یا بڕوا هەرای دەکاتێ ودەیخوا.

وەختێک کاتی ڕاوە کەوە کە بتوانێ هەست بەمەترسی بکا. لەلای شنۆ لە ١٥ ی خەرمانانەوە دەست پێدەکا تا بەرەبەری زستان. لە زستاندا کەو نابێ ڕاو بکرێ چون وەختی جووت* بوونیەتی.

- هەر دەعبایەکی کەوی* وکێوی تایبەتی یەکی هەیە. تایبەتی کەو چیە ؟

- کەو یەکێک لە جوانترین شاکارەکانی خیلقە-تە. لە خۆشترین و دلڕفێنترین جێگا دەژی. جێی خۆش ئاووهەواو زنوێرە دەنگیشی زۆر هەست بزوێنە و گۆشتەکەشی لە هەموو فڕندەی دیکە بەتامترە. دەنگەکەیەتی کە زۆرتر لێی بووەتە بەڵا. پێی لە باڵی بەهێزترە. زۆر زوو لەبەر چاو ون دەبێ لەنێو داڵدە خۆ دەشارێتەوە و هەتا مەترسی نەگاتە ئەوپەڕی خۆی نافرێ. ڕاوچی یەکی لە حەوا بینگێوێ زۆر، شارەزایە. دەعبایەکی زۆر بێ زەینیشە.

- زۆر لە ڕێنوێنیت سپاس دەکەین وهیواداریـن بۆ زۆر مەبەستی دیکەش ڕێنوێنمان بی.

- سپاس وشانازی دەکەم بەوە کە شتێک بزانم وبە کاری ئێوە بێ.

ئەم پرسیارە لە زۆر، کۆنەوە لەناو خەڵکدا هەیە ژیان هەمیشە پرسیارێکی گرینگ بووە و زۆر کەس وەڵامی بۆ نەدۆزراوەتەوە. مێژوو دەڵێ ئەو زەمانی کە **ئەفلاتوون** شاگردی **سوقرات** بوو ئەم پرسیارە لەگۆڕێ دا بوو. پاش تەواو کردنی دەرس خوێندن ئەفلاتوون فێرگەکەی خۆی بە ناوی "**ئاکادێمی**" بەرپا کرد و شاگرد وقوتابی زۆری لەخۆی خڕ کردەوە کە لە هەموان بەناوبانگتر **مامۆستای یەکەم ئەرەستوو** بوو. پرسیاری "**ژیان چیە**" لە ئاکادێمی دا کەوتە ژێر باس ولێکۆڵینەوەی زانایان و فیلسووفەکان. بەو پێیە ئەگەر بڵێین تەمەنی ئەم پرسیارە بە درێژی تەمەنی ئینسانە هەڵەمان نەکردووە، چونکە ئێستاش ئەو پرسیارە لەنێو بەرەکانی ئادەمیزادی سەر زەوی دا دووپات دەکرێتەوە. زۆر زانای بەمێشک ومژی هەڵوەدای دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەن و بیروڕای جۆراوجۆر بڵاو دەکەنەوە.

ناتوانین بڵێین ئەم پرسیارە هیچ وەڵامی نەدراوە-تەوە. بە پێچەوانە دەکرێ بڵێین کە هەر کەسێک بەزەین وسەلیقەی خۆی وەڵامێکی داوەتەوە. واتە ژماری ئەم وەڵامانە دەگاتە بارستای ژماری دانیشتووانی سەر زەوی چونکە هیچ کەس وەک وەڵامی کەسێکی دیکە ناچێ. دەتوانین هەموو ئەم وەڵامانە دەستە دەستە کەین و هەر دەستەیەک بۆخۆی ڕێبازێکی ژیان دەستنیشان دەکا.

ژیان چیە؟ ڕاستی ژیان چیە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە زۆر ڕێبازی ئایینی وڕامیاری و ئابووری و زۆر لێکدانەوە و بۆچوونی فەلسەفی وحەکیمانە داڕێژراوە وهەر ڕێبازەش کۆمەڵێک لە جەماوەری خەڵکی لەخۆی کۆ کردۆتەوە وبۆ وچان تێدەکۆشن ژماری لایەنگران زیاد کەن و بە زۆرە ملی و شەڕو هێزی زۆرتر بیرو بڕوای خۆیان بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنن.

بەختەوەرانە جاروبار تووشی هێندێک وەڵامی بێ لایەنانە دەبین کە سەرنج ڕاکێش وپەسندی مێشک ومژی ئادەمیزادن.

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیار بێ گومان دەبێ پێشەکی مانایەکی ڕوون بۆ واژەی، مرۆڤ بدۆزینەوە. مانای مرۆڤ بەڕواڵەت زۆر سادە و ساکارە. بەڵام لە ڕاستیدا وانیە. ڕەنگە لە دنیای ئەمڕۆدا ولە چوارچێوەی زانستی پێشکەوتوودا هیچ شتێک لە خودی ئادەمیزاد نەناسراوتر نەبێ. جاباشترە لێرەدا خۆمان لە باسی ئادەمیزاد ناسین بدزینەوەو بگەڕێینەوە سەر پرسیاری "ژیان چیە؟" چونکە ئەگەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکە بە مانایەکی ڕوون بۆ واژەی مرۆڤ ببەستینەوە بە هیچ ئاکامێک ناگەین.

بۆ ئەوەی هێندێک لایەنی وەڵامەکەمان بۆ ڕوون بێتەوە ئەو پرسیارانەی خوارەوە دەخەینە بەرچاو و

لە بەرامبەر هەموویاندا
وەلامێکی "نە" دەنووسین .
- ئایا ژیان یانی
عەرابەی لاشەکێشان ؟
- ئایا ژیان یانی
بۆ ئامانجی وبەزین و ئاخ
و ئۆف ؟
- ئایا ژیان یانی
ژیانێکی مردوویی و بۆ
بزووتنەوە ؟
- ئایا ژیان یانی
پێوانی ڕێگەی نێوان ماڵ و
ئیدارە ؟
- ئایا ژیان یانی
بوون بە بوونی نێوئاوێنە ؟
- ئایا ژیان یانی
هیچ وپەنا بردن بو
قوتابخانەی هیچی گەری
پانکیسم ؟
- ئایا ژیان یانی
هەر لەبیری پرچی خاو و
چاوی کەژاڵ دا بوون ؟
- ئایا ژیان یانی
بە هەر بایەکشەن کردن ؟

- ئایا ژیان یانی
هەراج وفرۆشتنی گیان لە
بازاڕی بێ گیانان دا ؟
- ئایا ژیان یانی
هەر گەمە و گاڵتە ؟
- ئایا ژیان یانی
هەر " خۆت " ؟
پاش نووسینی " نە "
بەرامبەر بەو پرسیارانە

ڕەنگە ئاوا بنووسین :
- ژیان یانی مەلەکردن
لە دنیای یەک سللول دا .
- ژیان یانی چوون
دەناخی دەروونی یەک ئەتۆم.
- ژیان یانی جۆلانە
هەڵبەستن لەناو نێرۆنەکانی
مێشکدا .
- ژیان یانی هەڵفڕین
بۆ ناو ئەستێرەکان .
- ژیان یانی خولدان
و سووڕانەوە بەنێو یاساکانی
بیرکاری دا .
- ژیان یانی ئارەق
ڕشتن بۆ وەدەست هێنانی
یاساکانی کۆمەڵ .
- ژیان یانی کۆشش
بۆ دابین کردنی یاسای
مرۆڤایەتی .
- ژیان یانی بەگژ
پێشێل کەرانی مافی ئینسا-
نی دا چوون .
- ژیان یانی
بەختەوەرانە مردن .

**فۆرمی ئابوونمان**

**شمارە**

ناو ........ شۆرەت ........ دانیشتووی ........

....... تمەنم بەحیسابی ژمارە ٥٤٠٠ ی شوعبەی ناوەندی بانکی سپەی ڕەمی گرت و
فیشەکەم وتێرای ئەم بەرگە بۆ نادرن . لەژمارە ........را هەتا .......گۆواری سروەم.
بۆ بەرێ بکەن .

ناونیشان ........

........

# ڕێنوێنی ئەدەبی

**بۆکان ـ گوندی داشبەند:** کاك جەعفەر ڕووحی ڕادە

نامە پڕ لە گلەیی و بناشتەکەت گەیشت . برای بەڕێز ئێمە لە خودامان دەوێ تۆ شیعری چاك بنێری و ئێمەش چاپی بکەین . هەموو حەول وتێکۆشانی ئێمە ئەوەیە نووسەران و شاعیران کوڵ بکەن و بەرەوپێش بچن . بەڵام ئەم چوونە پێشە هەروا ئاسان نیە . ڕەخنەی دەوێ . ئیرادگرتنی دەوێ ڕێنوێنی دەوێ و هەزار شتی دیکەش . نابێ دڵت بێشێ . ئێمەش ناتوانین شیعری کز چاپ بکەین چونکوو خوێنەر کەوەخت و پوولی خۆی خەرجی سروە دەکا بابەتی جوانی دەوێ .

**مەسەلەن** هەر ئەو چەند شیعرەی لە ئاخری نامەکەتدا هێناوتە و ڕەنگە بەلای خۆتەوە شیعرێکی باش بێ دەیخەینە ژێر داوەری خوێنەران و لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە

کە باغی دڵ بەری هێنا کوڵاڵە
لە ئەو باغە بەبۆنی تۆ کوڵاوم
بەهاری کوردەواری خۆشەویستم
کە لاوەوا خەیاڵی ئاڵوزاوم
ئەگەرچی پیروئوفتادە وزەعیفم
لە بەرتۆیە عەزیزم تازە لاوم

ئێمە ئیرادمان لەو شیعرە زۆرە . بەڵام هیچ نالێین با خوێنەران خۆیان داوەری بکەن . بە هیوایین دەست لە شاعیری و کەشە پێدانی زەوقی نەتەوەیی هەڵنەگری و لە ڕەخنە وئیراد گرتن نەترسی .

سەرکەوتوو بی .

**سنە:** ئەنوەر ڕەوشەنی

برای بەڕێز بەختەوەرانە کوردی نووسینەکەت زۆر باشە و توانیمان نامە و شیعرەکانت بەئاسانی بخوێنینەوە . بە هێندێك تێکۆشان دەتوانی بێ هەڵە بنووسی . زۆربەی شاعیرانی کۆن و تازە نازناویان هەیە . هۆی هەڵبژاردنی نازناو ئەوەیە ـ شاعیر نایەوێ بناسرێ . یان کەسێکی خۆش دەوێ و لە ناوی ئەو خۆشەویستە کەڵك وەردەگرێ . مەسەلەن **سەعدی** ناوی خۆی لە ئەمیر سعدالدین سعدابن زنگی وەرگرتووە . جاری وایە خۆشەویستی وڵات سەرچاوەی نازناوە یان بیروباوەڕ . مەسەلەن **هەژار** لایەنگر و ئەویندارى هەژاران و زۆر ـ لێکراوان بەتایبەتی کە لەکەی وادارى کردووە ئەم نێوە هەڵبژێرێ . یا دیسان **هێمن** باوەڕ بە ئاسایش وهێمنایەتی بۆ بەرەی سروف ئەم نازناوەی بۆ دارشتووە .

شیعرەکانت بە نیسبەتی تازە شیعر گوتنت زۆر باشن . هێندێکی تر شیعری بەکەڵك بخوێنەوە و شێوەی شیعرگوتن چاو لێکە فێر دەبی . باشترە لە نازناوی " ئاسۆی مەریوان" کەڵك وەرگری .

**برای بەڕێز:**

نامە و شیعرەکانت گەیشتە دەستمان زۆر سپاست دەکەین . **ڕێنوێنی** ـ یەکانت جێگەی سەرنجن و ئەگەر لە دەستمان بێ دەبەرچاویان دەگرین .

لە نامەکەتدا چەند پارچە شیعرت بۆ ناردووین کە دەگەڵ ڕێبازی **سروە** ( فەرهەنگی ـ ئەدەبی ) ڕێك ناکەوێ . بەڵام شیعرێکت دەخەینە **ژێر** **شی** کردنەوە :

**ژیانی ژن و مێرد**

ئاوای گوت شەوێ شەم بە پەروانە (۱)
ج سوودی هەیە ئەم هەڵسووڕانە (۲)

*   *

خۆت ئەسووتێنی تۆ لە پێی مندا (۳)
منیش دەتوێمە و ،ئاوا بێ مەودا (۴)

*   *

وەڵامی داوە پەپوولەی خاڵ جوان (۵)
لە ڕۆژی ئەزەل براوە بۆمان (۶)

*   *

شەوگاری درێژ وا سەرینە سەر (۷)
بەغەیری ئەمە ژین ناچێتە سەر (۸)

تۆلە پێی منداومن لە پێی تــــــۆدا (٩)
ژینمان بەسەرکە ین لە ڕێی یەکتردا (١٠)

شیعرەکەت زۆر جوانە بەڵام ئەو ئیرادانەی هەیە ٠ دێڕی ٤ فەسیح نیسە لە دێڕی ٧ و ٨ دا "سەر" ڕەدیفە ٠ واژەی "بەرینە" و "ناچێتە" قافیــــە نین ٠ لە دێڕەکانی ٩ و ١٠ ش دا "تۆ" و "یەکتر" قافیە نین ٠

**سەقز : کاك زاهید کازمی**

نامەکەت کە یشت سپــاســــت دەکەین٠ چوارخشتەکیەکەت جوانــــە و هەر لێرەدا چاپی دەکەین وراى خۆ... مان دەردە بڕین :

دنیا بە غەم و عەزابە وە شیرینــە
نۆش کردنی دەردی عیشقە مانــای ژینــە
هەرکەس دەیەوێ ژینی بەراستینی بێ
مافی هەر هەژاری و کەســەر و ئەسرینە

لە باری وەزن وقافیە وە هیـــــــ ئیرادی نیە تەنیا "ژینی بە راستینـــی بێ" فەسیح نیە٠ مەبەستــــی تـــۆ بیکومان ژینی تێکەڵ دەکەڵ ڕاستی و سەداقەتە کە بەو تەرکیبە جوان بـــاس نەکراوە ٠

**شنۆ : کاك کەریم محەممەد ئەمینی زادە**

شیعرەکەت گەیشت داوای ڕێنوێنی دەکەی٠ ئەمەش ڕێنوێنی ئێمە لە سەر شیعرەکانت :

سروە گیان جێی تۆ لە نێو ئێمە کوڵــە
نێو کرلاندا تۆ کوڵی جوانی منـــــی
فەرهەنگی میللەتی کوردی ئەتـــۆ
مانگێ جارێك وا تۆ میوانی منــــی

دێڕی سێهەمی ئەم شیعرە لە باری وەزنەوە دەکەڵ ئەوانی دیکە یـــەك ناکرنەوە ٠

شەوقی ڕۆژی چووتە واو بوو.ئاسمان ژێر سێبەرە
بولبولیش لەم باخە ڕۆیی ونە سڵـــی هیجران هێنەرە
کەرچی لەم جێگایەدا ئـــــاوازی بولبول کەم بووە
لە نێو باخی دڵم دا دەنگی یــــارە خوێنەرە

دێڕی ئاخری ئەو شیعرەش لــە بـــاری وەزنەوە ئەوانی دیکە ناکرێتەوە ٠

شیعرەکانی دیکەشت هەر ئەم لەنگە و لۆزییەیان تێدایە٠ئەوەش با بکوترێ بە نیسبەتی تەمەن و پلەی دەرس . خۆێندنت (کلاس اول ٨) شیعرەکانــــت زۆر بەرزن ٠

**کاك س ٠ خ ٠ شەپۆل** ٠

شیعرەکەت ساوایە ورۆریش وەنەسر دەچێ ٠ شیعری نوێش لە باری هیجایی ــ یەوە وەزنی هەیە بەلام لەو شیعرەی تۆدا ڕەچاو نەکراوە بۆ وێنە نووسیوتــە

لە ژێر سێبەرێك
سێبەرێکی ڕەش
غەم و تۆری پەژارە
لە ئامێزی دا خەوتبوو

**پیرانشر : کاك سەلمان نەبی**

شیعرەکەت وەزنی هەیە بـــــە لام نابێ مانا فیدای وەزن بکەی و یا بـــۆ قافیە وشە بشکێنی ٠ بۆ وێنە لە وشیعرەدا

شوان بۆشە وێنێ بە بەزم وخۆشــی
ئەیخا سەرئاکر کتریەکەی ڕەشی

ئەو شیعرە وەزنی هەیە . بـــــە لام "ئەیخا" مانای نیە٠ نـــابێ بـــۆ هێنانەوەی وەزن چەند پیتی وشەیەك هەڵکرین ٠ لە سەریەك شیعرەکــەت جوانە وچاوەڕێی شێعری جوانترین ٠

**بۆکان : کاك م ـ ك ٠ ناکام**

شیعرەکەت زۆر لاوازە٠ نابێ لـــە نووسینی شیعردا پەلە بکەی دە بـــێ لە پێشدا شیعر بناسی ودیوانی شاعیرانی بەناوبانگ بخوێنیەوە ئەوجار شیعــر بڵێی ٠ بۆ وێنە ئەو شیعرەت وەزنـــی نیە ومەسرەعی دووەم زۆر درێژترە لـــە مەسرەعی ئەوەڵ ٠

**دەڵێن شاری خۆشەویستانە**
**جێی بیری ئازادوکانکای جوان**
**پەرستانە**

سەرکەوتووبی ٪

**مەهاباد : کاك سولەیمان خزرپوور**

نامە وشیعرەکانت کەیشــــت ٠ هەستی ناسکی شاعیرانە یــە کـــەم کەرەسەی پێویستی شیعر کوتنـــی شاعیرە٠ ئەو هەستە لە شیعرەکەت دا بەرچاوە٠ بەلام وەزن وئاهەنگــــی شیعرەکەت جێگا ،جێگا کۆڕاوە٠ ئەوەش کە مێك لە شیعرەکەت " :

ڕۆیشتنت
مالاوابیت
لە سەر ئەم شاخە چڕەوە
لە نێو ئەم مژەدا (لەنێو ئەم تەم ومژەدا)
جاریکی تر
ژەنگی دڵم دەشۆیتەوە
بەلام نا (٢)(بەلام ئەی تاقانە کوڵم)
بۆئەم کۆچەت ٣ـ(پاش ئەوکۆچەت)
دڵی من بۆت ئەتوێتەوە،ئەتوێتەوە
بەهارەکەم
دەمەڕۆ(٤) (لە لام مەڕۆ)
دەمەڕۆ (٥) (لە لام مەڕۆ)

لەو بەشەی شیعرەکەت دا ئــەم بەشانەی بە ژمارە دیاری کراون وەزنیان لەکەڵ باقی شیعرەکەت یەك ناکرنەوە لە ناو پەرانتێزدا چاك کراوی شیعرە ــ کەمان بۆ نووسیوی

**ورمێ: کاك ٠ع٠ دیــانــەای**

نــامەکەتمان چاوپێکەوت زۆرخۆشحـاڵ بووین٠ پێشنیارە جوانەکەت لـــە بــەر چاودەکرین وهەروەکوو لـــە پێشـــوودالـە بارەی شیعــری نوێ دواوین لە داهاتووش دا . خوایاربێ لەوبارەوە وتاربلاودەکەینەوە٠

ئەو شیعرەی دەکەل نامــەکـــەت ناردبووت جوانە بەلام دەکەڵ ڕێبــــازی سروەیەك ناکرێتەوە٠ چاوەڕوانی بەرهەمـی دیکەی ئێوە خۆشەویستانین٠

# حەسەن زیرەک

کەریم قەیسوومی

بولبولی دەنگ خۆشی کوردحەسەن زارعی مەشهوور بە حەسەن زیرەک ساڵی ١٣٠٠ ی هەتاوی لەشاری بۆکان لە دایک بوو. تافی منداڵی و مێرمنداڵی و لاوەتی خۆی هەر لەشاری بۆکان رابوارد. لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵی دا شاری بۆکانی بەجێ هێشت و هەڵوەدا بوو. تا لە ئاکامدا لە عێراق گیرسایەوە وپاش ماوەیەک کە دەنگ خۆشی ئەو لەوێ دەنگی دایەوە داوایان لێکرد تا بچێتە ئیزگەی رادۆی بەغدا وگۆرانی یەکانی تۆمار بکا.

زیرەک ئەو کارەی کرد و لە رادۆی بەغدا دامەزرا لە ماوەی مانەوەی لە بەغدا پتر لە ١٥٠ ئاهەنگی تۆمار کرد. پاشان دڵی بۆ زێدی کورکاندی وسەرەڕای حەول ودەولی زۆر بۆمانەوەی بەغدای بەرەو ئێران بەجێ هێشت. کوردی عێراق زۆر لە ڕۆیشتنی بەداخ بوون و ئێستاش لەوێ وەک دەنگ خۆشێک جێگەی لەنێو دڵی هەموو کەس دایە وکەم ماڵ هەیە شریتی ئەوی لێ نەبێ.

پاشگەڕانەوە بۆ بۆکان ماوەیەکی زۆر شار و گوندەکانی وڵات گەڕا و لە ئاکامدا بەدەستی پڕ بەرەو تاران وکرماشان و تەورێز وەڕێ کەوت و لە ڕادوێی ئەم شارانەدا دەستی بە تۆمار کردنی گۆرانی کوردی کرد ولەماوەیەکی کەمدا نزیک بە ٢٦٠ گۆرانی بڵاو کردەوە.

بایەخی کاری هونەری زیرەک لەوە دایە کەسەرەڕای نەبوونی خوێندەواری بە تەواوی دەزگاکانی مۆسیقا شارەزا بوو. ئاهەنگی دادەنا وشیعریشی دەگوت.

زیرەک تا ئەو کاتە مرد دەستی لە گوتن هەڵنەگرت تەنانەت لە نەخۆشخانەش بەسەرهاتی خۆی بە دەنگ دەگێڕێتەوە و شریتی بێ مۆسیقای نەخۆشخانەی بەناو بانگە.

زیرەک لە ماوەی ژیانی خۆیدا پتر لە ١٠٠٠ گۆرانی تۆمار کراوی هەیە ئەویش بەرجی ئەو گۆرانی یانە کە بەتایبەتی لە ماڵێ دۆست

و برادەری خۆی تۆماری کردوون .

زیرەک بێجگە لە دەنگ خۆشی وگۆرانی گوتن خزمەتێکی هەرە گەورەی بە فەرهەنگ و هونەر و کەلەپووری کوردی کردووە چون لە ماوەی ژیانی گەڕۆکی خۆیدا سەری لە هەموو کون و کاژێر و شار وباژێری کوردستان هەڵیناوە و هەموو فۆلکلۆرەکانی کۆ کردوونەوەو سەر لەنوێ بۆ ئەوە لەنێو نەچن گوتوونیەوە و لە تێداچوون وفەوتان پاراستوونی هۆی سەرەکی زۆر بوونی گۆرانی ئەو هونەرمەندە ئەم فۆلکلۆرە کۆ کراوانەن.

ئەلبەت زۆر ئاهەنگیشی بە شیعرەوە داناوە و لەم بارەشەوە هونەری کوردی بە ئێرووتر کردووە .

گەڕان و هەڵوەدا بوون بۆ زیرەک بەرهەمێکی دیکەشی هەبوو ئەویش ئەوە بوو کە بەرجی فۆلکلۆری کوردی لەگەڵ فۆلکلۆر و هونەری فارسی وعەرەبی و تورکی و ئەرمەنیش شارەزایی پەیدا کردووە . لەسەریەک بە پێنج زبان گۆرانی گوتووە .

هێندێک لەم گۆرانی یانە لەسەر سەفحە لە شاری تەوریز بڵاو کراونەوەوئێستاش هێندێک بەدەست خەڵکەوە ماونەوە . بەرهەمی دوامین زەماوەندی خواڵێخۆشبوو دوو کیژۆڵەن بەناوی ساکارو ئارەزوو .

زیرەک ساڵی ١٣٥٠ لە شاری ورمێ بۆ دوامین جار پاشەبەرەی گۆرانی یەکانی تۆمار کرد و لەمە بەدوا نەخۆش کەوت . دوو شریتی پاڕانەوە ودەردی دڵ و بەسەرهاتی لە نەخۆشخانە بڵاو کردەوە . دیسان مەرگ بەربێنگی بەردا و هاتە شاری مەهاباد و ماوەیەک لەم نێوە ماوە . تا ئاخری لەساڵی ١٣٥١ دا لە شاری بۆکان ئەجەل ئەوکێ گرت و ماڵاوایی پێ لەگەڵ دونیا کرد .

پاش مەرگی زۆر کۆڕ و مەجلیس لە ئێزگە کوردی یەکان گیرا و زۆریان شین بۆ کرد و زۆر شیعر بەیادی گوتران و زۆر وتار بەیادی نووسران.کەدەتوانین لەنێو ئەوانەدا کتێبی " حەسەن زیرەک" ناو بەرین .

حەسەن زیرەک دەنگ خۆشێکی ئەوتۆ بوو کە بە زۆربەی زاراوە وبن لەهجە ـ کانی کوردی گۆرانی ومەقام و بەستە و ئسترانی بڵاو کردوتەوە .

بەپێی ژمێرەگۆرانی یەکانی حەسەن زیرەک ئەوانەی تا ئێستا بڵاو بونەوە وبەدەست خەڵکەوەن ١٠٦٥ گۆرانی و بەستەیە وبەناوی " باوکی هەزار تەرانە" ناسراوە .

کتێبێک بەناوی **چریکەی کوردستان** دەرچوو کە وەکی دەڵێن بۆخۆی گوتوویە و بۆیان نووسیوەتەوە . لەم کتێبەدا ژیان و بەسەرهاتی خۆی بەوردی گێڕاوەتەوە و بنۆسێ چەند گۆرانی و مەقامی بەناوبانگی خۆی باس کردووە .

ئەم هونەروەرە هەتا هەتایە لەنێو دڵی خەڵک و لە قامووسی هونەری کورددا جێی هەیە . حەسەن زیرەک لە زۆربەی دەزگا و مایەی ڕەسەنی ئێرانی داوەک سێ گا ـ چوارگا ـ ماهوور ـ دەشتی ـ بەیاتی تورک ئیسفەهان ـ هومایوون ـ شوور ئەبووعەتا ـ شووشتەری ـ حیجاز ئەڵڵا وەیسی ـ ئەفشاری بەیاتی کورد ئاهەنگی هەیە

لەژیانی هونەری حەسەن زیرەک دا تەنیا عەیبێک هەیە بەناوی ڕەخنە بەڵام جێی زۆر لێدوان نیە ئەویش ئەوەیە :

حەسەن زیرەک لە زۆربەی مەقامەکانی خۆیدا شیعری شاعیرە بەناوبانگەکانی کورد وفارسی گوتووە بەڵام نەک زۆر بەرێک وپێکی بەڵکوو هێندێک جێی دەستتێوەرداوە ئەویش واویدەچێ چون سەوادی نەبووە و شیعرەکەیان بۆ خویندۆتەوە هەمووی بێ کەم و زیاد لەبیر نەماوە و هێندێک جێی لەبیر چووەتەوە

و لەخۆوە پێی زیاد کردووە
زیرەک شیعری شاعیری وەک نالی، مەحوی، کوردی تاهیربەگ ، ناری، پیرە مێرد، هێمن ، هەژار، سەید کامیل وسافی و...... لە مەقامەکانی خوێدا هێناوەتەوە
زیرەک وەختێک باسی ژیانی کوردەواری دەکا لە نێو بالۆرەی کوردی هەوایەک هەڵدەبژێرێ و بەناوی هۆ کاکی جووتیار دەڵێ:

هۆ کاکی جووتیار کارت شێوەردە
گایەکت سوورە یەکێکت زەردە
بەعام دەیکێڵی ئەو کێو و هەردە

* *

هۆ کاکی جووتیار بە جووتیارت بم
لە مووچەی بەردێ نێوەکارت بم
تۆ زێڕی حالیس من عەیارت بم

وەختێک باسی دڵداری دەکا بەیتی شەم و شەمزین دەکاتە گۆرانی و بەناوی **شایی یەک دەگەڕێ** دەیڵێتەوە:

شایی یەک دەگەڕێ
چرای لە دڵم
جا وەرە بیبینە
دوو کەسی تێدان
بە کۆیلەت بم
دڵیان خەمگینە
یەکیان بووکە شەم
چرای لە دڵم
یەکیان شەمزینە

یان لە گۆرانی نسحەت بۆ دڵداردا دەڵێ :

نەسیحەت بێ بۆ دڵداری
عاشق نەبن بەرێبواری
چونکەعاشق دڵی خوێنە
خۆی دەکوژێ بەناچاری

* * * *

عاشقان دێن لە دوور دیارن
ڕەنگیان زەردو لێو بەبارن
مەنعیان مەکەن سێحەب یارن
بەدەردی دڵ گرفتارن

ئەویش بەشێک لە گۆرانی قاسپە قاسپی کەو:

خۆمن کوێستانی لەندنیم
بێنم کارگ ورێواسان
هیچ من قەرەنیاغا نیم
گەورەی عێلی بلباسان
رادوێ تەلەویزیۆن نیم
دامبنێنن بۆقسەوباسان
عاشقی دووچاوی کاڵم
دەیرفێنم سووک وهاسان

* * *

وەکوو کوێستانی بیستوون
دایمە سەرم بەتەمە
لەبەر خۆفی خودام نەبێ
وەک جووبۆی دەگرم شەمە
ناوێرم دووقسەی پێ بڵێم
دەڵێن خەڵکی عەجەمە
لەئێران وئەلمان و ڕۆم
جوانی وەک لەیلم کەمە

وەختێک باسی منداڵەکانی دەکا دەڵێ :

خونچەی دڵەکەم ئارەزوو
بۆم دەبێ بەگورزو بازوو
خودایە شوکرم بەتۆ
هەم مەهتاب وخاڵ لە روو
خونچەی دڵم مەهتابە
ماچی بۆمن کەبابە
خودا هێندەم نەکووژێ
مەهتاب پێم بڵێ بابە

ڕەنگە ئینسان نەزانێ لەنێو هەزار گۆرانی و بەستەدا چەند نموونەدەربێنی بەڵام گرینگ ئەوەیە شێوازی کارەکەی بناسرێ دەنا هەر کەس پێی خۆش بێ دەتوانێ زۆربەی ئاهەنگەکانی وەدەست بخا وکەڵکیان لێ وەربگرێ .

لە نووسینی ئەم کورتە بەسەرهاتەدا کەم و کووڕی یەکجار زۆرە ئەویش بەدوو هۆ:

یەکەم: بەڵگەی نووسراوەی وا قایم بەدەستەوە نیە کە کەڵکی لێ وەربگیرێ .

دووەم: بەسەرهاتێکی هونەرمەندێکی ئاوا لە کورتە باسێکدا ناگونجێ .

بەم هیوایە ئەوانەی لەسەر حەسەن زیرەک دەزانن بینووسن و کۆیان بکەنەوە بەڵکوو بە هەموان بتوانین ئەم هونەروەرە نەمرە باشتر بناسێنین .

تێبینی : لەپڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی رێنووسی کوردی بەپێی رێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە رەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (ˇ) دانەنراوە . واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی ( شڕ، گوڵ، زۆر، شێر و . . ) ی تێدا بێ بە شکڵی ( شر ، گول، زور ، شیر و . . ) دەنووسرێ

١ـ ناوی زانای بەناوبانگی کورد لە جیهانی ئیسلامدا ـ تەبیعی و سروشتی ٢ـ پارچەیەکی تەنك وناسك ـ تەکیەکە لامی دەروێش ـ بووك ـ نیشانەی کۆکردنەوەی ناو لە زبانی فارسی دا ٣ـ کەوشەن ـ مەرتەع ـ شارێکی کوردستانی ئێران ٤ـ سنوور ـ واحیدی پۆتانسیەل ـ وەتاغ ٥ـ ناوێك بۆ کچی کورد ـ مەر بووتە بە مانگی نیسان ٦ـ رێگای کورت ـ دژی مردوو ـ مات وبێدەنگ ٧ـ لە پشتی گیاندار دایە و کۆڵەکەی بەدەنە ـ تازە جواب ٨ـ دوژمنی ژنی بە مێرد ـ ئەسپی خۆشبەز ٩ـ پلەیەکی دەوێ بۆ ژمارەی سەت ـ سەقزی بە کوردە دەڵێن ـ تا پتر بێ کەشك رەق تر دەبێ ١٠ـ دنەهەوایەکی کۆنی مۆسیقای کوردی ١١ـ سکڵ وپۆلوو ـ زبان ـ گەورە ١٢ـ بە ٠٠٠ خەرج کردن یانی زۆر خەرج کردن ـ خوری پێ دەرێسن ١٣ـ کینە ـ ژمارەیەکە ـ پاڵەوانێکی شانامە ونووسەرێکی کوردـ لە ولاوە دەبێتە جەنابت ـ برێکی ماوە پێی بپێوی ! ١٤ـ گیاندارێکی گەورەی دەریایی ـ دۆست و خۆشەویست ـ باوەڕ بە قسەی وا مەکە ـ کەنگی ١٥ـ خوراکێکی شل ـ شارێکی گەورەی کوردستانی تورکیا ٠

١ـ رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی ئاڵمانی کە بەیتەکانی ناوچەی موکریانی کۆ کردۆتەوە ـ غەم و پەژارە بۆ کەسێك خواردن ٢ـ ماڵ ـ ئەگەر پیتی "خ"ی پێوە با لە ئازەربایجان دا چت وەدەست نەدەکەوت ـ زەین ـ زێڕ یا زێوی تواوەوە ٣ـ شووشەی بێ غەل وغەش ـ پیتێکی ئەلف وبێ ـ دەچاوی دەکێشن ـ شاخە ٤ـ ئاگا وڵە سەر هەست ـ شیری پێ دەکەنە ماست ٥ـ جارز ـ ئارا و قرارـ جێ پێ ٦ـ هەولێری دەڵێ " بۆ" ـ نازداران هەیانە ـ سکاڵا و تووك و دوعا ـ سەرەوبنی کەو رێبدەیە "هار" دەبێ ٧ـ گێژ ـ لە سەر قامکان دەروێ ـ عادەت کردوو ٨ـ بنۆش ـ نومایندە یا وەکیل ٩ـ بەیتێکی کوردی ـ جوولەکە ١٠ـ بێ دایك وباب ـ ئازا ونەترس ـ بڕیار و نەزەر ١١ـ رۆژ ـ وڵاتێکی ئەفریقایی ـ کێوی سووتاو ١٢ـ ئێمە بە ئینگلیسی ـ کلکت نەبڕی با هار دەبوو ـ پشمین و کۆخین ١٣ـ ئاواش هەر شوێنە ـ گیایەکی کوێستانی ـ رەنگێکە ـ کاتێك ١٤ـ کۆمەڵێك کە بۆ پاراستنی مافی ئابووری خۆیان یەك دەگرن ـ وشیار و زانا ١٥ـ چەکوچ وەشێنی رۆڵە کوژراو ـ دێوەزمە ـ یاد

تێبینی

لەنێو ئەو کەسانەیدا کە پڕکراوەی دروستی ئەم جەدوەلەمان بۆ بنێرن بەپێی قورعە یەک کەس بە بەرەندە دەناسرێ

جایزەی بەرەندەی جەدوەل ، بریتی یە لە ساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروە .بەرەندەی جەدوەلی ژمارە ١٤ کاک نەجمەدین عەبدوڵلا پوورە لە نەغەدە .

پڕکراوەی جەدوەلی ژمارە ١٩

شنۆ: کاک سەدیق هەژاری

برای بەڕێز فەرهاد قارەمانێکی ئەفسانەیی یە وسەرکوزەشتی مێژوویی نیە. ئەو قارەمانە پەروەردەی زەین وفکری نیزامی گەنجەوی یە ولەچیرۆکی شیرین و فەرهاددا باسی هاتووە کە ئەویندار ی شیرین بووە ولەرێگەی ئەم ئەوینەدا خۆی کوشتووە و بۆتە ئەفسانە. بەپێی چیرۆک فەرهاد بەردتاشێکی زەبەردەست بووە وکۆشکی بەردینی بۆشیرین لە بەرد هەڵکەندووە. ئێستا لە ناوچەی کرماشان وسەرانسەری کوردستاندا لەهەر جێگەیەک بەردی تاشراو هەبێ دەڵێن کاری فەرهادە.

بیستون را عشق کند وشهرتش
فرهاد برد
جورگل بلبل کشید وبوی گل
راباد برد

مەهاباد: کاک فەرهادجیهان میهەن

بەڕاستی هەروایە "میرات بە دەستی منداڵان شەڕە" وەختێک پیرە باب مرد منداڵ دەکەونە گیانی یەک وهەر دەڵێن "کوا بەشی من؟ بۆ نادەنێ؟"

لەباری ڕێنوێنی یەوە ئێمە لە سرووەدا هەمێشە لە ئێمە و خوێنەر و ڕێنوێنی ئەدەبی دا ڕەخنە دەگرین ورێنوێنی خوێنەران دەکەین. هەرکەس بەوردی ئەم دوو بەشە بخوێنێتەوە زۆری کەڵک لێ وەردەگرێ.

ئێمە وێنەی ماموستاهێمن ـ مان بەلاوە نیە. تا بۆ خوێنەرانی بەڕێ بکەین. وێنەی گەورەی ماموستاهێمن لەسەر بەرگی ژمارە٥ی سرووەدا هەیە ژمارێکی زیادی بکڕەوعەکسەکەی ڕابگرە.

سەرکەوتووبی.

خورینج: کاک مراد سوهرابی

پاش سڵاو. برای بەڕێز ئەم وێنەی بۆت ناردبووین زۆر لە دوورەوە گیرا بوو. بەردەکانی خورینج دەبێ لە نیزیکەوە ولە چەند زاویەرا عەکسیان لێ هەڵگیرێ. دەنا بەکاری چاپ نایە.

بەهیوای عەکس ودیاری جوانتر ـ ین.

سەرکەوتووبی.

شنۆ: کاک بەدیع مەحموودی

برای بەڕێز نامەونووسراوەکەت لەمەر "ماڵە خۆکردن" گەیشتە دەستمان. وتارەکە بابەتێکی جوانە بەڵام کورتە وزۆر بەپەلە بەسەری دا تێپەڕیوی. وتاری کۆمەڵایەتی دەبێ زۆر ورد و هەمە لایەنە بێ ولەباری ئابووری و کۆمەڵایەتی وئەخلاقی وزۆر لایەنی دیکە شێ بکرێتەوە.

پێویستە پێت بڵێین کە دەتوانی بنووسی وکوردیش باش دەزانی.

بەهیواین وتاری جوانترمان بۆ بنێری.

سەرکەوتووبی.

پیرانشار: کاک یوسف مستەفاپوور

برای بەڕێز ئەو گەورە پیاوەی موکوریانی کە مەرقەدی لە مەهابادە. مەلا جامی یە.

شنۆ ـ حوجرەی فەقێکان: کاک محەممەد زوڕناچی وکاک هیدایەتی چاوشی

نەچن لەبەر سەرما دەست لەخوێندن هەڵگرن .شتی وا نابێ بۆ گەرمداهێنانی حوجرەش هەزار ڕێ هەیە. ئەوەش بزانن کە خوێندن وپێگەیشتن هەروا ئاسان نیە. دەبێ هەزار چەرمەسەرەی ڕۆژگار ببینن، چەق وتەقی زۆری پێدەوی،سەرما وهەڵ لەرزین، دوغرەمە وتێکوشین،بڕوێشە روونەی بێ زەرنووقە ولێفە شڕە وبەرە کونەی حوجرە، چاو لەدەستی و هەزار شتی دیکەتان لەڕێ دایە. ئەوانەش خودا یاربێ دەگەڵبوون بە مەلا هەمووتان لەبیر دەچێتەوە.

سەردەشت گوندی مامکاوێ: مەلا محەممەدی جەلیل زادە

ئەو شیعرانەی بەنێوی خۆت ناردووتن ( هەتا شێخێک لە کوردستان بمێنێ ـ ئومێدی زیندەگانیت پی نەمێنێ) هی حاجی قادری "کۆیی"ن وناتوانین بە ناوی ئێوە بڵاویان کەینەوە.

سەرکەوتووبی.

بانە: کاک سەلام محەممەدپوور

برای خۆشەویست زبانی هەر نەتەوەیەک تەمەنی بەقەدرایی تەمەنی نەتەوەکەیەتی. زبانی کوردیش هەروایە وهەزاران ساڵی تەمەنە .نووسین وخوێندنەوەی کوردی بەشێوەی ئەمرۆ سەدەیەک لەمەوپێش دەستی پێکردووە.

ژماری کوردەکان لە سەرانسەری جیهاندا دەبێتە رەقەمێکی نێوان ١٥ تا ٢٠ میلیۆن کەس .

کتێبی "ریاض الصالحین" لەژێر چاپ دایە وهێشتا دەرنەچووە. دیارە وەختی خۆی خەبەردار دەبی وخودا یار بێ دەیان کڕی .

سەرکەوتووبی

**نەهاوەند: کاك رەمەزان ئیسماعیل پوور**

سڵاوی ئێمە بە هاورێکانت ئەنوەر و هووشەنگ بگەیەنە. ئەوەش وەلامی پرسیارەکانت :

**١ـ** هەروەك نووسیوتە ئەمساڵ ساڵی ٢٥٩٩ ی کوردی یە وپێشنیارەکەت لە سروەی ژمارە ٢ دا باس کراوە. هێندێك کەس لایان وایە ئەم تاریخە دەقیق نیە و لە بەر ئەوە دە کاری ناهێنن. ئێمەش لە بەر ئەوەی گەلێکی موسوڵمانین و شانازی بە وە دەکەین تاریخی شەمسی هیجریمان هەڵبژاردووە. دیارە تاریخی ٢٥٩٩ ش بە لامانەوە بە نرخە وریزی بۆ دادەنێین .

**٢ـ** قەلاتی شای لە ناوچەی مەنگورایەتی دایە و ئێمەش هەر تەنیا نێومان بیستووە وهیواداریـن کورێکی بە هیممەت قۆڵی لێ هەڵماڵی ولێی بکۆڵێتەوە وئاگاداری یەکی تەواومان بۆ بنیری تا بلاوی کەینەوە. زۆرمان پێ خۆشە باسی ئاسەوارە میژوویی یەکان لە سروە دا بگونجێنین . تا ئێستاش لەو کارە دا بەردەوام بووین .

**٣ـ** وەیسولقەرەنی لە ئەسحاب و یارانی پێغەمبەری مەزن بووە . بەلام حەزرەتی غەوسی گەیلانی (عبدالقادر گیلانی) عاریف وسەودا ـ سەری ئەوین وعیشقی ئیلاهی بووەو نەسەبی لە سەردەرانەی بارەگاکەی نووسراوە :

مادر ز حسین باشد واماپدر او
زاولاد حسن یعنی کریمالولدین
است

**٤ـ** باسی جوغرافیایی شارستانە ـ

کانیش وردە وردە لە سروە دا بلاو دەکەینەوە. تا ئیستا لە هەر ژمارەیەك دا سەرگوزەشتی شاعیرێکمان بلاو کردۆتەوە و درێژەش بەو کارە دەدەین. وەرزیشی سوننەتی کوردستان زۆرەوانی، تۆپەڕاکردێن ، مەلە و زۆر شتی دیکەن کە هیواداریـن باسی بکەین .

**کاك دلێر**

نامە جوانەکەت دەگەڵ دوو نووسراوەی کورت کەیشتە دەستمان. لەم هەموو لوتف و خۆشەویستی یەت سپاس دەکەین و هیواداریـن هەر سەرکەوتوو بی . نووسراوەکانت زۆر کورت و سادە بوون . ئێمە نازانین جەنابت لە یۆگوسلاوی خەریکی چ کارێکی . بەلام تکامان ئەوەیە ئەگەر بۆت دەلوێ و ئیمکانت هەیە مەبەست و بابەتی سەنگین و دوورودرێژترمان لە سەر میژوو یا فەرهەنگ و فۆلکلۆر بۆ بنێرە تا بلاویان کەینەوە.

هیواداریـن سەرکەوتووبی .

**ورمێ : کاك ئاورەحمان واوی**

برای بەرێز شیعرەکانت بۆ شاعیرێك کە تازەی شیعرگوتنی دەست پێکردووە زۆر بەرز وبە نرخن بەلام هێشتا نەگەیشتوونە رادەی بلاوکردنەوە لە سروە دا . بە هیواین لە دوارۆژێکی زۆر نیزیك دا بە شیعرەکانت سروە برازێتەوە .

**مەهاباد : کاك فەخرەدین**

برای بەرێز ئەو کتێبانەی داوات کردوون هیچکامیان بۆ فرۆشتن لای ئێمە دەست ناکەون. ئێمەش وەک تۆ لەوەی کەکتێبی کوردی لە کتێبخانەکاندا کەمە نارەحەتین وئەوەی هەشە زۆرگرانە وەک گۆرانی بێژی کورد دەڵێ :

" چبکەم دەقیمەت نایە بۆتە کەوڵی دەڵەکێ ."

ئێمەش کاغەز وهەل ودەست رۆیشتوویی پێویستمان نیە کتێبەکان چاپ کەینەوە .

سەرکەوتووبی .

**رەواندوز: کاك حەمید ئاکۆیانی**

نامە و شیعرە جوانەکەت گەیشت . رەخنەکانت لە سەر شێوە و ریباز و ناوەرۆکی بابەتەکانی سروە زۆرجێگەی سەرنجن و کەلکیان لێ وەردەگرین . لێرەدا پێکەوە بە دەوری پرسیارەکانتدا سووڕێکی خامە بادەین .

**١ـ** نووسیوتە شیعری کلاسیك لە سروە دا زۆر بلاو دەبێتەوە و ئێستا سەردەمی هۆنراوەی سەربەستە. لە وەلامدا دەلێین لە کوردستانی ئێران هەموو لایەنێك لە فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی تازە وەدەست لێ نەدراوە. چونکو تا ئێستا رۆژنامە و کۆواری کوردی بلاو نەبوونەوە. لە سەر ئەوەش را ئێمە بە شێکی گرینگمان بۆ شاعیرانی لاو (کە زۆرتر شیعری سەربەست یا نوێ دەلێن) تەرخان کردووە .

**٢و٣ـ** سەرنووسەرودەستەی نووسەرانی کۆڤار پێویست ناکا بناسرێن چونکە کارەکەیان هێندەش جێگەی شانازی نیەو ئەو خزمەتە چکۆلە بۆ خۆڕانان نابێ . وەك نووسیوتە چیرۆکەکانی سروە نیشانەی کۆنیان پێوە دیارە. ئەمەش هۆی ئەوەیە کە ئەو کارە لە کوردستانی ئێراندا تازە دەستی پێکردووە و هێشتا پوختە نەبووە .

**٤ـ** ئێمەش پێمان وایە چیرۆکەکانی منالان زۆریان لە گەل میزاجی منالان ناگونجێن بەلام ویستوومانە ئەو چیرۆکە کۆن و لە مێژینانەی لە رابردوودا هەمان بوون وردە وردە کۆ بکرێنەوە و لە ناو نەچن . هیواداریـن لە داهاتوودا ئەوە بە شەئاڵ وگۆری پێویستی تێدا بدرێ و بە پێوەری زەمان نوێ بکرێتەوە .

**٥ـ** باسی جوغرافیایی لە سەر داخوازی زوربەی خوێنەران بلاو دەبێتەوە و دەتوانێ لە چوارچێوەی گۆوارێکی فەرهەنگی ـ ئەدەبیدا جێگەی بۆ دابین بکری .

**٦ـ** شیعرەکەی بۆت ناردووین زۆر جوانە وئەگەر بگونجی لە بەشی شاعیرانی لاودا کەلکی لێ وەردەگرین .

# شاعیرانی لاو

**ئەحمەد ح**

هەرچەند دەکەم خەیالّی تۆ
لەناو دلّما ئەسپەرّدەکەم*
هەرچەند دەکەم، دەرکەی دلّم داخەم لە رووت
هەرچەند دەکەم لەگەلّ بیرت
خورپەی دلّم بتاسێنم
هەرچەند دەکەم دەردی دووری
میهرت لەدلّ دەرکاتە دەر
هەرچەند دەکەم لەبەر دووریت
مانگ کەمە جیلوەی روومەتت
شەو تابەیان، بێ چاو قووچان
بە تاسەوە تەماشای کەم
هەرچەند دەکەم پرشنگی خۆری بەربەیان
دانێم لەجێی پرچی کالّت
لێم بەرنایە، لێم بەرنایە
گیانە چبکەم ؟ بەو خودایە
کە دانەری ئەرز وبایە
دلّم لەسەریەک سەودایە ،
دەردی دلّم بەغەیری تۆ
بەهیچ شتێ دوایی نایە
دەرکردنی میهرت لەدلّ
هەتا مردن، لێم بەرنایە
هەتا مردن لێم بەرنایە.

رۆژهەلّات دیوار ،رۆژئاوا دیوار ،باکوور دیوار
باشوور دیوار ئاسمان دیوار زەوی دیوار
ولّاتەکەم! ئەی سەربەستی!
کە هەموو لایەک دیوار بێ؟
لە کامە کون ودرزەوە تۆ ببینم ؟
تۆ شەمالّ نی هەتا هاشەتم گوێ لێ بێ
کۆتر نی تا ئاگام لە شەقەی بالّت بێ
تۆ هەتاو نی ،
تیشکت برژێتە ژوورەکەم !
ولّاتەکەم! ئەی سەربەستی!
تۆیان هەزارەها قۆناغ لەمن وەدوور خستۆتەوە
کەچی لەراستی دا ئەو هەزارەها قۆناغە
هەریەک مەترە !
چ جودایە ؟
هەزارەها قۆناغ
چ یەک دیوار !
بەلّام ئەوان گەلی گێلن ونازانن
تۆ لە دلّمای
نە دەتوانن لێت بدەن و
نە دەشتوانن لە بەندیخانەت بئاخنن !

**عێراق**

**سەفین خۆشناو**

## کەریمی بەرادۆستی

دەردی کۆمەڵ گەلێ زۆرە
هەزاررەنگە و هەزار جۆرە
کە وابوونە هۆی دواکەوتن
لە خەرابەی غەما خەوتن
بوونە هۆی ئازارو برین
یا بوونە ژان بۆ گیان وژین
ئەم دەردانە بەیان بکرێ
ئەبێ چل کتێب بنووسرێ
ئینجا یەکی لەم دەردانە
قسەی بەردەرگای ژنانە
واکەمێك لەم دەردە ئەدووم،
هەرچەند زۆرتە واو بۆی نەچووم
کوڕ گەل گوێ بگرن لەم باسە
باسی کۆمەڵی کەساسە
لێدوان لە نیوەی گەلە
وائەی نووسم بە بێ پەلە
دوێنێ لای بانکی نیوە ڕۆ،
قالەی برام لە تانجەڕۆ
تووشی دوو کابرای دز بوو
هەرچی پێ بوو پوولو سەعات،
لێ یان ستاند وئەوهەلات
وتی نە وەك بشم کوژن
چونکە دز زۆر ئیمان سزن
ماڵی دنیا نرخی نییە
سەربمێنی پارە چییە

* * *

ئیتر بەم جۆرە قسانە
هەم بە لۆمە هەم بە تانە
وەخت وسەعات بەسەر ئەبەن
بارئاش لە هەزار ئاش ئەکەن
بەلام ئاشیک نا مالنەوە
رازی کەسیش ناشارنەوە
ئەمەش دەردێکی کۆمەڵە
کەتووشی بووە ئەم گەلە
هەربە شوعلەی خوێندەواری
ئەم دەردانە ئەکرێ چاری

## عوسمان خدر پەنا

نامرێ هەرکەس لە دڵدا نووری یەزدانی هەیە
غەیری خوا کەس ناپەرستێ هەرکەس ئیمانی هەیە
خوا پەناهی بێ پەنایانە دەزانین بێ گومان
هەر کەسێ کە خواپەرست بێ زوهدو عیرفانی هەیە
کوردی خواناس وبە ئیمان پەیڕەوی رێگەی حەقە
گەل پەرستە وباوەڕایە عیشقی یارانی هەیە
ترس و خۆفی قەت نیە پێی هیچە زوڵمی زاڵمان
ئەو کەسەی زاڵم شکێنە هەستی مەردانی هەیە
ئەو کەسە کوردە کە بێگانەی نەوێ ونە یدا پەنا
خۆشەویستە ئەو کەسە چون عیشقی کوردانی هەیە
بێ بەش وچەوسایە کورد. وایە بیری زاڵمان
ئەی عەزیزان چاوهەڵێنن کورد دلێرانی هەیە
من بە زامی دڵ گرفتارم لە بۆ کوردی هەژار،
ئێوە راستم پێ بڵێن ئەم دەردە دەرمانی هەیە
باغەوان دەسکێ گوڵی بۆن خۆش ورازاوەم دەوێ
غەیری تۆ ئەی "باغەوان" کێ واگوڵی جوانی هەیە

رەسووڵ وەیسی

# شێر و ڕێوی

ڕۆژێک لەرۆژان شێرێک لەڕاو دەگەڕا چاوی بە ڕێوی یەکی برسی کەوت ، لێی چۆ پێش و گوتی :

– سڵاو مام ڕێوی، لەگەڵ ئەو زەمانەی چۆنی ؟

ڕێوی کە لەبرسان هێزی لێ بڕابوو، بە دەنگێکی لەڕ وەڵامی شێری داوە وگوتی:

– برالە جا چۆن بم باشە، وەڵڵاهی لە برسان سەرم دەسووڕێ و تاقەتی چیم نیە .

شێر گوتی :

– هەی لەمنت نەکەوێ، گوتم داخوا چیت لێ قەوماوە ! هەستە ، هەستە با .بڕۆین .

ڕێوی گوتی :

– بۆکوێ ؟

شێر گوتی :

– تۆ چیت لەوە داوە ؟ ناتهەوێ تێرت کەم؟ ببە بە پیاوی من . هەرچی ئەمن خواردم دەیدەم بەتۆش .

ڕێوی گوتی :

– بڕۆ کاکە بڕۆ، لێمگەڕێ، من ئاواڵی تۆ نیم، پیاوێکی دی بۆخۆت پەیدا بکەی باشترە.

شێر گوتی :

– کەیفی خۆتە من دەڕۆم و تۆش لێرە لە برسان بمرە .

ڕێوی کە بۆی دەرکەوت ئەگەر لەگەڵ شێر نەچێ لە برسان دەمرێ گوتی :

– ئەگەر بەڵێنیم پێ بدەی هەموو ڕۆژێ تێرمکەی دەبم بە پیاوت ولەگەڵت دێم .

شێر و ڕێوی هەرچۆنێک بوو پەیمانیان بەست و بە یەکەوە چوونە ڕاو . هەموو کەژ و کێوێک گەڕان تاگورگێکیان بەرچاو هات .

شێر ڕووی لە ڕێوی کرد وگوتی :

– تۆ لێرە ڕاوەستە و هەرچی ئەمن گوتم بڵێ بەڵێ .

ڕێوی گوتی بەڵێ بەسەر چاو .

شێر وردە وردە لە گورگ نێزیک بۆوە و بە دەور وبەری داهات و چوو

بە ڕێوی گوت :
چاوم سوور بوونە ؟
ڕێوی گوتی :
بەڵێ ، بەڵێ سوور بوونە .
شێر هێندەی دی هات و چوو گوتی :
ـ تووکی پشت ملم هەستاون ؟
ڕێوی گوتی :
ـ ئەرێ وەڵڵا هەستاون .
شێر دیسان هەر هات و چوو گوتی :
ـ کلکم گەیشتۆتەوە نێو چاوانم ؟
ڕێوی گوتی :
ماشەڵڵا ، لەو عەزەمەتــەی !،،
قەت شتی وانیە ! ، لە نێــوچاوانیشــت
تێپەڕیوە .

شێر زۆر بە گورج و گۆڵی ئامبازی
گورگ بوو و نێو سکی بە گۆڕێ وەرکرد.
ئەوجار لەگەڵ ڕێوی ملیان لە گــۆشــت
خواردن نا .

چەند ڕۆژ بەم چەشنە تێپەڕ بوو ،
ڕۆژ بە ڕۆژ سفرەی ڕێوی ڕەنگیـــن تر
دەبوو. کار گەیشتە ئەو جێگایەی کە لە
خۆبایی بوو و گوتی :
ـ جا بۆ ببمە پیاوی شێر ؟ چم
لەوی کەمترە ؟ وا چاکە ئەمنیش یەکێک
بدۆزمەوە و بیکەم بە پیاوی خۆم .

ڕێوی گەڕا سووڕا تووشی ڕێوی یەکی
لەخۆی لەڕ و لاوازتر هات و گوتی :
ـ سلاو ئەی دۆستی دێرین . ئــەوە
بۆوا کز و داماوی ؟
ڕێوی لاواز گوتی :
ـ بەسەری تۆ لەبرسان هێزم لەبەردا
نەماوە، چەند ڕۆژە هیچم بــە گــەروودا ،
نەچۆتە خوار.
ڕێوی بە قەڵەوە گوتی :
ـ هەی لەمنت نەکەوێ گوتم داخـــوا
چ بووە واخۆت بە عەرزێوە مەڵاس کردووە.
هەستە هەستە با بڕۆین .

ڕێوی لاواز گوتی :
ـ بۆ کوێ ؟
ڕێوی بە قەڵەوە گوتی :
ـ کارت بەوە نەبێ، لەسەر ئەوەنــی
تێرت کەم ؟
ڕێوی لاواز گوتی :

- چۆنم تێر دەکەی ؟
ڕێوی یە قەڵەوە گوتی :
- ببە پیاوی من هەرچی ئەمن خواردم دیدەم بەتۆش .
ڕێوی لاواز گوتی :
- برۆ کاکە برۆ ئەتۆش هەر وەکوو من ڕێوی چت لە من زیاترە ببم بە پیاوی تۆ ؟
ڕێوی یە قەڵەوە گوتی :
- کەیفی خۆتە، هەزاری وەک تۆ هەن ببن بە پیاوم . ئەمن دەڕۆم و ئەتۆش لێرە لەبرسان بمرە. با قەل و داڵ بتخۆن .
ڕێوی لاواز زانی ئەگەر ڕەگەڵی نەکەوێ لەبرسان دەمرێ گوتی :
- بەڵێنیم پێ دەدەی فێڵم لێ نەکەی و تێرم کەی ؟

ڕێوی یە قەڵەوە بەڵێنی داو هەر دوو ڕێوی بە یەکەوە کەوتنە ڕێ. کەژ وکێوو مێرگ و چیمەنێکی زۆر گەڕان شتێکی ئاوایان دەست نەکەوت کە دەرووەستی بێن بیکووژن و بیخۆن .
ڕێوی لاواز گوتی :
- نەمگوت تۆش هەر وەکوو منی و چت لەدەست نایە ؟
ڕێوی یە قەڵەوە گوتی :
- پەلە مەکە، هێندێکی دی ددان بە جەرگتەوە بگرە تووشی شتێک هەر دەبین. لەو قسانەدا بوون کە بارگینێکیان بەرچاو هات .

ڕێوی یە قەڵەوە گوتی :
- وەرە ئەوەی لێی دەگەڕام دۆزیمەوە ئەتۆ لێرە ڕاوەستە و چاوم لێکە. بەڵام هەرچی ئەمن گوتم بڵێ بەڵێ و کارت نەبێ.
ڕێوی وردە وردە لە بارگین نیزیک بۆوە، هەر وەک شێرەکە بە دەوروبەری داهات و چوو رووی لە ڕێوی یە کزە کرد و گوتی :
- چاوم سوور بوونە ؟
ڕێوی لاواز گوتی :
- نەخێر چاوت هیچ سوور نەبوونە .
ڕێوی یە قەڵەوە گوتی :

- بلێ بەڵێ .

ڕێوی یە لاوازە گوتی :

- بەڵێ سوور بوونە .

ڕێوی هێندێکی دی هات وچۆی کرد وگوتی:

- تووکی پشت ملم هەستاون ؟

ڕێوی یە کزە گوتی :

- کوڕە ناوەڵڵا تووکی پشت ملیشت چ هەڵنەستاون و شۆڕ نەبوونەتەوە .

ڕێوی گوتی : بلێ بەڵێ .

ڕێوی یە کزە گوتی :

- بەڵێ ئەویش هەستاون .

ڕێوی دیسان بە دەوروپشتی بارگین داهات و چوو گوتی :

- کلکم گەیشتۆتەوە نێوچاوانم؟ .

ڕێوی یە کزە گوتی :

- گەیشتنەوەی چی و حاڵی چی،کلکت هۆ...وە لە دوات دەخشێ .

ڕێوی کە ئارەقەی ڕەش و شینی دەردابوو قەڵس بوو و گوتی :

- بلێ بەڵێ .

ڕێوی یە کزە گوتی :

- بەڵێ قوربان کلکیشت زۆر بەجوانی گەیشتۆتەوە نێو چاوانت .

ئەوجار ڕێوی کشاوە دواوە و خۆی بلێند و نەوی کرد و چاوێکی لە ڕێوی یە کزە کرد، دەگەڵ خۆی بەبارگین دادا بارگین بە هەموو هێزەوە جووتە یەکی لە ڕێوی دا و لە لایەکی دی لە عەرزی دا. ڕێوی کەوتە پەلەقاژەی مەرگ .

ڕێوی یە کزە لە قاقای پێکەنینی دا و چووە لای ئەربابەکەی دەستێکی بە سەری داهێنا و گوتی :

- ئەیلۆ بەستەزمانۆکە. ئەوجار چاویشت سوور بوونە، تووکی پشت ملیشت هەستاون ، کلکیشت کە هەر قسەی تێدا نیە زۆر بە جوانی گەیشتۆتەوە نێو چاوانت .

ڕێوی مرد و ڕێوی یە کزە تێری خوارد .

# تەواو

## پاشماوەی میعراج

کە بوراق لەوێ وەستاوە، جبرەئیل فەرمووی: " ئەی رەسووڵی خودا، سواری بوراق بە تا تۆبەرمە "بیت المقدس" هەروەکوو خودای "عزّوجلّ" فەرمووی:

**سُبْحانَ الّذی اَسْری بِعَبْدِهِ ....**

وئەوەش هەمان بوراقە کە حەزرەتی ئیبراهیمی بۆ دیتنی حەزرەتی ئیسماعیل بە شەو لە شامرا بردە مەکە و هێنایەوە.

پێغەمبەر (ص) فەرمووی کاتێک جبرەئیل منی بردە "بیت المقدس" دەستی منی گرتوو بردمیە، مێعراج، لەو ئاسمانە بۆ ئاسمانێکی تر، لەو ماوەدا شتی زۆر عەجایبم دیت، تا گەیشتمە ئاسمانی چوارم کە هەموو ئەرواحی پێغەمبەرانم لەوێ دی، "شجرةطوبی" و "بیت المعمور"یشم دیت، جبرەئیل هەروا ئەمنی دەبردە سەر تا گەیشتمە ئاسمانی حەوتەم، و لە حەفتا هەزار پەردەی نوور تێپەریم تا گەیشتمە ئەو شوێنە کە جبرەئیل فەرمووی ئێرە ئاخرە وقسان بکە، پێغەمبەر فەرمووی:

**"اَلتَّحیاتُ لِلّهِ وَ الصَّلَوةُ الطَّیِّباتُ"**

خودای مەزن جوابی داوە:

**"اَلسَّلامُ عَلَیکَ اَیُّها النَّبی وَ رَحمَةُ اللّهِ وَبَرَکاتُه"**

رەسووڵی خودا فەرمووی:

**عَلَینا وَعَلی عِبادِ اللّهِ الصّالِحین .**

مەلائیک وتیان:

**"اَشهَدُ اَن لا اِلهَ اِلّا اللّه وَ اَشهَدُ اَنَّ مُحَمَّدً عَبدُهُ وَرَسُولُه ."**

لەو شەوەلە وجێگەیەداوا جباتی وچۆنیەتی نوێژ بەپێغەمبەر راگەیاندرا، دوای ئەو خودای "عزّوجلّ" فەرمووی:

**"آمَنَ الرَّسُولُ بِما اُنزِلَ اِلَیهِ مِن رَبِّه"**

واتە ئیمانی هێنا رەسووڵ (ص) بەو شتەی لە لای خودای خۆی بۆی نازل بوو. پێغەمبەر (ص) فەرمووی: بەڵێ ئیمانی هێنا.

دوای ئەو جبرەئیل هەشت دەرکی بەهەشت و حەوت تەبەقی جەهەننەمی نیشان دام و عەزابی کافرانیشم دی.

(وەرگێڕاوەی تەفسیری تەبەری ٩٠٩- ٩١٦)

لەبارەی مێعراجی شەوانەی پێغەمبەر (ص) دوو شت دەڵێن: یەکیان ئەوەیە کە رەسووڵ (ص) گوتی: من لە حوجرەی "مسجدالحرام" دا خەوالوو بووم کە جبرەئیل هات وبوراقی بۆ هێنام. ئەوی تر ئەوەیە کەرەسووڵ (ص) گوتی منیان لە حوجرەی "اُمهانی"را بردە ئاسمان. جا لە "تأویل"ی ئایەتەکەرا "حرام" بە مانای "مسجد" هاتووە و دەڵێن قەولی هەوەڵ دروستە چون ئایەتە- کەی دەگرێتەوە.

لە خودی "اُمهانی" خوشکی "علی بن ابیطالب"دەگێڕنەوە کە گوتی:

"رەسووڵیان لە حوجرەی من را بردە ئاسمان. نوێژی خەوتنانم دەگەڵ کرد و نوستم، وەخەبەر نەهاتم تا بەیانە کە بۆ نوێژ هەڵیستاندم. دووپاتی کردەوە و گوتی:
ئەی "اُمهانی" هەستە تا بەسەرهاتێکی سەیرت بۆ بگێڕمەوە.

گوتم یا«رسول الله»قسەی تۆ هەموو سەیر و گرینگن. وەختێک نوێژەکەی کرد فەرمووی:

" شەو تۆ نوستی و من بەخەبەر بووم، جبرەئیل بانگی کردم ووتی هەستە وەرە کاتێک لە ماڵ هاتمەدەردیتم جبرەئیل لە کن ئەسپێک راوەستابوو، فەرمووی سوار بە، منیش سوار بووم ووەڕێ کەوتین، لە هەر شوێنێک کە دەگەیشتە نشیوێک دەستەکانی درێژ دەبوو و لاقەکانی قوڵە دەبوو، و لە هەر شوێنێک کەدەگەیشتە بەرزایی لاقەکانی درێژ دەبوو ودەستە-کانیشی قوڵە دەبووە، تا گەیشتمە "بیت المقدس".

(مجمع البیان ج ٦ ـ صفحە ٣٩٤)

(ابوالفتوح ج ٦ ـ صفحە ٢٥٦).

دبێژن ل دەورێ بەرێ مرۆڤەک هەبوو ، ئەڤی مرۆڤی دخاست بچەسەفەرێ. لێ کیسەک زێرێ وی ژی هەبوو ،ترسا دزا ورێ گرا نزانی کاچ بکە . دترسی یارێ دا دزوچەتە بێنە پیشی یێ وزێرێ وی لێ بستینن . چ بکە چ نەکە؟ نشکا ڤا هاتەبیرێ کوزێرێ خو ببەبدە قازی وبسپێرەوی تا ل سەفەرێ زڤرێ. بەلێ مێرکێ رێڤی کیسێ زێرێ خو هلانی وچوو باقازی وزێرێ خوسپارتە وی وچووسەفەرێ.پاشیماوەیەکێ ل سەفەرێ زڤری وچوو لالێ قازی وزێرێ خوژقازی خاست .

قازی ب سۆسرەت و زەندەمایی گوت :" توچ دبێژی؟ ئەزتەناس ناکم . تو کێ یی؟ زێرێ چ؟"توچما ئیلاڤا* ل م دکی. دەرکەڤەدەرڤا! "

مێرکێ رێڤی کۆروپۆشمان دەرکەتەدەرڤا ، نەشەهەد هەیە ،نەسەرپەلگە . خودێ، چ لێ بکە؟

ــ ئەورۆژێ دانەکی دهاتەبەردەرێ مالا قازی و لاڤا*یی وئاەوزاری دکر وزێرێ خو ژقازی دخاست .لێ قازی قەتگوهنەددا ئاەوزاری وپاریانا وی وهەرجار پارا بەرددایێ وئەول مالا خو دەردخست .

ژنەک زانە ودلۆڤان هەڤ- هێسیا مالا قازی بوو. ئەول هاتوچوون وچاوانییا شەپرزەیە مێرکێ رێڤی کەتە شکێ ورۆژەکێ ل مێرک پرسیار کر وگوتێ:"چەومییە؟چ هەیە؟ ئەڤا چەند رۆژە تو ئوهاتێ و دچی و وەها شەپرزە وشورێ؟"

مێرکێ رێڤی سەرهاتییا خۆ و بێخودێتییا قازی ژنکا دلۆڤان ڕاب هوورگلی شرۆڤەکر.

ژنکا دلۆڤان گۆتەمێرکێ رێڤی :ئەزێ بچمالا قازی تو ژی ماوەیەکی پشتی چووینا من وەرەمالا وی وزێرێ خو ژێ بخازە."

ژنکا دلۆڤان پێشتاچوو مالا خو وچەندکیسێ زێڕان هلداو گۆتە کەنزاخو ،"ئەزێ هەرمالا قازی ، تورا چاڤ کەددەماکو فلان مێرکێ رێڤی ژی هاتەمالا قازی ، پشتیوی تو ژی ب لەزوگولشا وەرەبا مەوبێژە خانم کامزگینی یا من، حەجی هات. "

ژنکا دلۆڤان ب کیسێ زیرا ڤەچوومالاقازی وب دلەکی شەوات گۆتە قازی:" مالخێ من چوویە حەجێ، توخوژی دزانی ڤان رۆژانا دز هەنە، ئەزدترسم دز داکەڤن مالامەو ئەڤان زێرانا بدزن . من ئەڤانا هانییە بلا ئەمانەتی باتەبن ، تاحەجی زڤری."

سێڤەک سۆر نەدچوو دەڤێ قازی. قازی سەرحەمدێ خو گۆت :" بلا بە ، ڤی شەهەری ــ دا حەموو ئەمانەتێ خو دسپێرنەمە ، سەرسەراو سەر چاڤا . "ل ڤێ گۆتنێ دا بوون کونشکاڤا مێرکێ رێڤی دەری ڤەکرو گۆتە قازی کا ئەمانەتێ مبدە .

ــ قازی سەرحەمدێخو و ب دلۆڤانی گۆتەرێڤی : " ئاکیسێ زێرێ تەوایە تاقچێ دا ، تەچاوا دانییێ هەما ئوساجیهێ خودایە ."

مێرکێ رێڤی بدلکی شاو دەڤکی کەن زێرێ خوهلدا. دەماک رێڤی زێرێ خوهەلگرت، کەنزاخانمێ دەری ڤەکرو ب گولشاییولەز گۆت :" خانمکا مزگینییا من بدە حەجی هات ."

ل ڤێ دەمێ دا ژنکا ، دلۆڤان کیسێد زێرێ خو بەرەڤکروورابوو.... خانم و کەنزورێڤی هەرسێ شابوونا دەست پێکرن کەنییان وکەیف خۆش بوون ، قازیژیچاڤ دا وان وکەنییا. ژنکا دلۆڤان ل قازی پرسی:

"ئەزکەیفخۆشم مێرێ من هاتییە ، کەنزشادبەکو مزگینی ڤەگرتییە ، رێڤی دکەنەکوزێرێ خودەست خوڤەئینایە ، لێ توچما دکەنی ؟ "

قازی گۆتئەز ژی بەر بایێ وەکەتمە .

# باكوروڤه

پ.جهانی

دانێ زڤستانێ یه سار دگه ل سڕو سه‌قه ما دلته زین ده ست پێ بوویه • گڤینا بایێ و ڤزینا باگه‌رێیه • بەر فاچیل و كه ڤه ره زڤستانێ ده‌ر و ده شت و چل و چیا نخابتی‌یه • د بێژی قه‌ی دونیایێ كه فه نه‌كی سپی ل خو كرییه • هندی چاڤ قه تەر دكه بەرفه و بلی بەر فێ چ تشت خوویا ناكه •

ته‌لته* عه ورێد كه ڤەر ل پانا تیبیا عه سمانێ پۆ خشید* ه دا بینانی رێوی و رێبوارێ كو ل باگه راندا رێیا خو شاش كربن و له‌ڤ بز ڤڕن و نزانبن كانێ یێ كو دا هه ڕن ، سه ر گه ردان و به ژید* ه نه • بەحرا پێل پێلی و بێ سەر و بنه به رفێ گشتی ئاقارێ دونیا یێ دایه بەر خو • عەرد و عه سمان چیل و كه‌ڤه‌ره •

نێچیر ڤانه كی پیر ل پێسیرا چیایه‌كی بلند كو سەرێ وی ناڤ گولتێ عه ورادا ئوندا بوو یه و قوو چاوی چوو یه بەر پەرێ عه سمانا، رێچا* كیژووشكه كی هلد ایه و پێسیرا بەحرا كه ڤه ره به رفێ دڤه‌لشینه و پێشدا دچه • ئه‌وی چه‌ند رۆژا به ری نهه كیژووشكه‌ك برینداركربوو، لێ نه‌شییابوو بگره • نێچیر ل گیڕاوی دەركه‌تبوو • ئه‌ڤه مده هه كه‌نێچیرڤان بەر پیرتی و بێ هێزی‌یێ نكاره نێچیره‌ك باش بكه • هه رچه ند كو ئێدی وه ش لێ دكه ڤه ، ئه‌مما نه شێ ده ست ژ راڤێ بكێشه • بیر و هرزێد ئالۆز ئه‌و ئاڤیتنه ناڤ هه‌ڤ • كوور دپۆنژه و دوو شۆپێ راد چه • رێچا كیژووشكێ بەرب گه‌لی یه كی كوور دچوو و كالۆ ژی ل دوو خوه را- دكێشا • خوونا سۆره كیژووشكێ جی جی‌یا رژیابوو سه ر بەرفا- كه‌ڤه ر و به فر خال خالی سۆر و گه ڤه ز كربوو • ئه ڤێ خوونێ طما نێچیرڤان بۆ ده ستڤه ئینانا نێچیری زێده و زێده تر دكر •

هند ه جیبیا باگه‌رێ كۆرو كه‌ند ئوسا تژی كربوو كو نێچیرڤان حه تا ناڤكێ ل بەرڤێ دا چك دبوو • هێ نێزیكی ب گه لی نه كربوو كو باگه ره ك گوژ ده ست پێ بوو • بوو فرتۆنه و باكورۆفه و رێچا كیژووشكێ ل سەر بەرڤێ بەژ*ر بوو • ئێدی چ رێچ و شۆپ نه دهاته خوویان •

پیره مێر توفه نگا خویه راڤێ ئاڤیت بوو ملێ خوو بێ حه مدێ خو ناڤ به رف و باگەرێدا گاڤ راد پیڤا • به رفێ سه ر گوهێ وی نخابت بوو • لێ پیره میر بینانی پۆ لا و ئاسنێ ئاڤد ایی، چ مننه ت ل باگەر و كورۆڤێ نه‌د گرت و سه رێ خو كربوو بەر خوو بەرف دقه لاشت و پێشدا د چوو • ئه وی ئه ڤ چل وچییا بهۆست بهۆست ناس دكر، لێ باو باگەرێ مه‌جا لا دیتن و ناسینێ لێ بریبوو • هێدی هێدی سه ها وه ستان و ماندی بوونێ دكر •

ده‌ڤ دۆرێ خو نهێڕی • چاڤێ وی ب تاته‌كی كه ت كو،كمێ* وی ل ناڤ بەرڤێ دا د هاته خوویان. به رب تات زڤڕی وچوو كوندكی* سه ر تات روونشت •

به رڤا سه رچاڤێ خو پاقش

كر و كوم و كنج و سۆل وزه نگالـێ

خو داكوتا . پێ كوژێ كه ڤی یـا

خو به رف و بووزا كو ب سمبێلـێ

وی ڤا گرت بوون ته‌میز كـر .

جگاره یه ك ل به ریكـا خـو

د ه رانی و ڤێخست* ، دوو كـه لا

جگارێ بینانی بۆرِیێ سۆبێ ل

ده ڤ و د فنێ وی را د هاویـت .

دیسا بیرو هزرێد ئالوزه چه نـد

ده مێ پێشین ئه‌و ناڤ هه ڤـد ا

گرتن . د ه ستێ خوه دا بن چه نـا

خو و كوور پۆنـژی . ئه ڤـا

چه ند رۆژه كو چ نێچیر ده سـت

نه خستییه . ئێد ی نكـاره

بد ه ستێ ڤالا و ئوستـی‌یێ خا ر

بزڤرِه مال . هه ر چاوابه د ه بـێ

كو ئیرۆ نێچیره كی بكه وبده‌سته ـ

كی تژی هه رِه با ژن و زارێد خو .

ل سه‌ر تات هلقه دمـی و

رابوو شێ* . چاڤێد خویێ پیـر

و قه رچمی كوتا بنێ گه لیـیێ

كوور . هه مانێ* ل بنێ گه لـی دا

ره شه‌ك به‌رچاڤا كه ت .ب هیڤی ـ

یا نێچیره كی به‌رب وی ره شـی

سه‌ر گه لی دا قولوبی و ژۆردا ـ

شوولكی و سینگێ كه ڤه ره به‌رڤێ

قه لاشت و پێشدا شقتی .

هێدی هێدی نێـزیكاتـی

ب وی ره شی دكر . چـاوێ خـو

كوس كوساند و دینا خودایـێ

ماله ك بێ خایی و خودان دووری

گوند ل ناڤ ده ریایا بێ سـه ر و

بنه به ر فاچیل وكه ڤه ردا نوقـم

بوویه . خانی دووری ڤا ل نـا ڤ

به رفێ بینانی خاله ك ره ش كـو

ل سه ر په ره ك مه زنه كـاغـه زا

سپی هاتبه نتلاند ن دیار دكـر .

یان ژی ته دگۆت قه ی كه له كـه ك

بچووكه بێ خویی یه كـو لنـاڤ

به حرا به رفێ دا جووم بـوویـه و

كمێ وێ بزۆرێ تێ خوویانێ .

تشته كی سرِی وخودایی نێچیرڤا ن

بێ حه مدێ وی به رب خـانـی

دكشاند .

سه قه مێ ل مه ژی و هه ستی یـێ

مرۆڤا كار دكر . له رز و رجـاف

كه تبوو له شێ نێچیرڤان وددانـێ

وی به ر سه رما له‌ڤ دكه تن .

كوله‌ك و په نجه‌را بچووكه خـانـی

ب پرتكێد د ه رزێ به شووشـێ

نیڤ ئشكه ستی و لا یلـۆنـا

هاتبوون نخابتن .

ئێد ی پیره مێر نێـزیكـی

ب خانییێ بێخایی كربوو . گوژینا

بایێ بوو. باگه‌رێ به رڤا گـرگ* و

تۆپكێد ده ڤ گه لی ل د ۆرها دۆرێ

خانی به ره‌ڤ دكر . بـه رڤـێ

به ژنا كنه د یوارێ مۆره یـه وێ

حه تانی نیڤی یێ زیـده تـر

دابوو به رخو .

چاردیوارێ وێ مـالـێ

كه تبوو گیرو هه لبۆڤا بـاگـه‌را

هێرش كه ر و به رڤا سار وگران .

هه وا ئوسا سار بوو كو شه واتـا*

هێد ی هێد ی تاری دكـه تـه

عه ردێ . شه ڤا زڤستانـێ یـه

سار ب كاروبار ل سه‌ر بینـا

نێچیرڤانێ پیردا خاربوو..... ....

شه ڤ سه رداهات . شه ڤه ك سار

و ره ش و تارو ترس ئینه ر ومت و

مات . خانی ل ناڤ ره شاتییـا

شه ڤێ و سپیتایا به رفێ دا كـرِ و

بێد ه نگ بینانی طه رمه‌كی بـێ

گیان بێ هه ژ ولڤ خو مات كربوو.

چ ده نگ و سه دا و هـه ژیـان و

لڤات به‌ر گوها نه د كمت و نه د ـ

هاته خوویان • هه ر ته نێ
ڤزینا بایێ و گڤینا باگه رێ بوو
کو بینانی قامچی یێ زالم وزۆردا-
را ل له شێ رووت و سارو سیوا خ
نه کرییه دیوارێ مۆره یه خانی
دگرت و ئاخین و نالین دکره
د لێ سك و ساره خانی و
بێد ه نگی یا شه ڤێ دشکاند•

ل دوورڤه ده نگه‌کی بینانی
زووڕینا سان یان لوورینا گورا
پیره میر ل ناڤ ده ریایا بیر و
هزرێد شووم و ئالۆز وترس ئینه ر
و به د یووم کو هش و هه دامێ
وی ناڤ هه ڤدا گرتبوون ده رانی •
پیره میر هاته سەر حه مدێ خوه ،
خوه به ره ڤ کر و گو هێ خوه
داگرت • ده نگ ده نگه کی ناسیار
بوو • ده نگێ گورێ برسی بوو کو
نیٚچیره‌کی دگه‌ڕیا • هه مان ده نگێ
کو چه ند سالا به ری نهه ب دەنگێ

گوللیێد توفه‌نگا نیٚچیرڤانێ پیر
د طه مرین • پیره میر بێ حه مدێ
خو به رب ده رێ خانی شقتی •
پێ لوولا توفه‌نگا خو دو سێ جارا
هیٚد یکا ل ده‌ری دا • لێ چ د ه نگ
و سه دا ل هوندوڕ خانی بەر گوهێ
وی نه که ت.دەری پێ د ه ستێ خو
پالدا و که ته هوندوڕ • چیرینه‌ك
سار ل قوڕانا دیڕی هات ،ده **نگه -
کی بینا ئشکه‌ستنا** تشته کی نازك
و حشك •

ته د گوٚت قه ی نیٚچیرڤان ل ده رڤا
پالدانه هوندور • هوندورێ خانی
بیٚهنا سڕو سه قه مێ ددا • با د-
که ته قه لشیٚد دەرێ دارینه رزی
بوویی و شووشیٚد دەرزی وئشکه —
ستییه په نجه رێ و نایلۆنا
سه ر کوله کیٚو ئه وانه ته‌ڤ
هه لدکوتان • ئارووك و بانێ
ئا لا ش کرییه خانی لبه ر
هیٚرشا باکو رۆفازۆردار دله‌رزین و
قرچه قرچ دکه ته بان و په ردی و
ئا لا شا • توز و ئاخه ك نه رم ل
بەر بانا دڕژیا هوندوڕ خانی •
هوورکیٚد به رقێ بینانی هوورێ
زیڤ ، زیڤال زیڤالی ل جه لغ و
قه لشیٚد دەری و په نجه رێ ڕا ،
نه رمك نه رمك به لا یی ناڤ
مالێ دبوو •

خووسێ خو ئاڤیت بوو ده رودیوارو
په نجه رێ، حه تا نیڤی یا دیوارا
ل خووسێ دا ئوندا ببوون • پشتا
تیکیٚد نیڤ ئشکه ستی یه
شووشیٚد په نجه رێ خووس
بینانی تیفاله ك زیڤێ خوری
د برسقی.ره شاتییا شه ڤێ و سڕو
سه قه ما زڤستانێ و گڤینا

باگه‌رێ د ه ست دابوونه هه ڤ و
بینانی کال کاپووس و پیر حه پۆکا
مه رڤ خور له‌کمێ خو ل دوٚر وێ
مالێ ئا لا ند بوون و ئه‌و ل
ناڤ هه ڤدا گرتبوون و خست-
بوون گیرو هه لبوٚقێ و د یل
گرتبوون.ته دگوٚت قه ی خانی
ترساڤا دنالی و دله‌رزی •

ل سەر ته خچکه کی فه نه‌رەك
هه مانێ د چرووسی و رۆناهی یا
وێ یه زەر و له رزۆك دابوو ناڤ
مالێ • ته دگوٚت قه‌ی دل هه یه
لوێ شه ڤاسارو سڕ وب سه قه مدا
ب وێ رۆناهی یا زه ر و له رزۆك و
گه رمایا بێ تینه خو پیٚشییا
هیٚرشا له شکه رێ هه ڤ گرتییه
به رف و باگەر وسڕو سه قه ما-
زڤستانێ و ره شاتییا شه ڤێ بگره
ونه هیٚله ئه‌و له شکه رێ شوومه
هه‌ڤ گرتی حوجوومێ بد ه نه
هوندوڕ • لێ ئه وێ ژی تاب
نه دئانی و جارنا دبوو پرته‌پرتا
وێ و خورانه‌دگرت و هند ك دما
بطه مره •

د یوارێ رووت و سیوا خ
نه کرییه هوندوڕ ل بەر زەراتییا
رۆناهی یا فه نه‌رێ بینانی
ته قه شا قه رچمییه پیره‌ك نیڤ
روحی د هاته بەر چاڤا • ل قونجه -
کی خانی پیٚشبه ری فه نه‌رێ ل سه ر
دۆشکه ك نقز سۆبه یه‌ك سەرگینا
ل خازیك و حه سره تا پولۆتیٚد
گه ش و ئا لا ڤیٚد گه رمه ئاگرێ
که رمێ مهی یاندا ده ڤێ خو
هه ڤ ڤه‌کر بوو • له شێ ره شه
وێ بینانی د ه ستێ قه لشی و
قالچك دائییه گونی چنا قه لش

قه لشی و کون کونی ببوو• ته
دگۆت قه ی ده ڤیّ خو ڤه کرییه و
چاڤیّ خو کوتایه دیّری و چاڤ-
نهیّره کو که سه ك به رمله ك
ئیّزنگ و حمیّزەك قرشك یان
توورەك د ه ڤه ده شتی باویّژیّو
دلیّ ویّ یه سار وته ڤزی گه رم
بکه• لیّ کانیّ ئەو مل وئەو باسکا
کو ل ویّ شه ڤا رەش و تارو ساردا ،
ئه و بگیهاندا مراز و مه طله با !؟
با دکه ته بۆری ییّ سۆبا سار و
ژه نگۆری و ده نگه کی بینا
ده نگیّ بلوورا شڤانەکی پیر و
ماندی کو ل بنیّ گەلییه کی
کووری دووردا مقامەکی شەوات ،
ل نیّری ییّ به ل حه مس را لیّده
ژیّ د هات •

ل بەر بایێ خولیا ساره
سۆبیّ هیّدی هیّدی و هندك هندك
ژۆ ردا دڕژیا عەردیّ وتۆزەك نەرم -
ژیّ قولۆز دبوو•

ئشکه ڤه ك دارینه لیّڤ
ئشکه ستی کو پیّ سفرکەك چەرمییه
پلپلی هاتبووڤه پۆشان ، د گەل
ساتله ك زیّجه ره شه ته ژی ئاڤ
ل قونجیّ دی یه خانی ل نیّزیکی
د ه ری دهاته خوویان •ئشکه ڤیّ دا
هەر ته نیّ دو ده سته نانیّ ره ق و
رووت ، حشك و ترسی وکارتۆ،کو
تنیّ بژیڤا زارێد مالیّ بوو خوویا
دکر• ساتلا ئاڤیّ ژی ل بەر سرو
سه قه میّ بیّنهت بوو وته لته یەك
بووزا شین روویێ ئاڤاویّ ڤه پۆشا-
ند بوو•

چاڤیّد زیت بووئییه
نیّچیرڤانیّ پیر ل رەخ سۆبا
سکه سار ب پا لا سه ك ره شه

مه زنه گنجرکەت کو د ه سته ك
جی نڤین ل سەر دانابوون •تلیاوی
بیّ حه مدیّ وی چوو سەر ته تکا
توفه نگیّ• باش به را خو دایێ
و هیّدیکا پیّشدا چوو• ترس وخۆف
که تبوو دلیّ وی • ل بەر نڤینا
راوه ستا • دینا خو دایێ دو کەس
تیّدا رازانه•• ئوسا خه وراچوونه
تو دبیّژی مرینه، یان هه لك و
نه فه سا وان بڕینه• بترس و لەرز
هیّد ی کوژیّ لحیّفیّ ل سه ر وان
راکر و دا ئالییه کی •
دیّ و قیزەك ل بن لحیّفەك قلیّر و
که ون و گنجر و کون کونی دا ل
به ر سه رما حشك ببوون • لحیّف
هند گنجر و پلپلی بوو ئه گەر
مه رڤ طایه ك ژیّ بکشاندا
هه زار پینه ییّ لیّ بکه تا •
دایکیّ قیزا خو حمیّز کربوو، هەر
دوو د ه ستیّ خو لیّ وەرکربوو و
قه په رچه کربوو، دابوو بەر
سینگیّ خو• ته دگۆت قەی
خاستییه قیزا خو ل ناڤ د لیّ
خوه دا جی که و کوتاترین
گه رمایا له شیّ خوه بەرد ه.
به ده نا کچا خو یه شرین و
خۆشد ڤی • به له نگازیّ چ بکه
جه گه ر شرینه •

پۆرێد دایکیّ ییّ حشك و
زڤرو ئالۆز و ڤزڤزکی بینانی
هیّلوونا خه رته له ك پیر که تبوو
سه ر با لگی ییّ ره شه چلکن و
قلیّرین • که زی ییّ قیزیّ ژی هرشیا-
بوون ره خ وان ، لیّ که زکیّ قیزیّ
بینانی د ه سته ئارمووشیّ په نگ
نه رم و با دایی بوون • خووسەك
نه رم ونازك ژی خو ئاویت بوون

سه ریّ گولی ییّ وی یه سۆری-
گه ڤه ز• خووسا زولف و که زی یا
ل به ر رۆناهی یا زه ره فه نه ریّ
د چرووسین ، یه کی نه به له د ییّ
بگۆتا قه ی خشر و زیّربه نی و
گوهار و به رجیّنیکیّ که چکیّنه ،
کو ل به ر سه ریّ ویّ د چلڤلن •

دو هیّسر بینانی دو
مرواریدا ل کانییا چاڤیّ
دیّ دا قه ڕسی بوون • زنگیّ زەر و
له ره دیّ حه تا چۆکا د ه رڤه
مابوو• ئه ڤ هه ردوو که سیّ
بیّکه س ل به ر سرو سه قه ما
زڤستانیّ و ره شاتییا شه ڤیّ
که تبوون خه وەك کوور• خه وا بیّ
شیاری و هه ره هه ره یی، خه واکو
ئاڤیّشا کولیّد ژیانیّ و د ه رمانیّ
د ه ردیّ د ونیاییّ و نۆژداروویا
رزگاری ل گیرۆداری و نه داری و
ژیّرباری یا دونیایا خاپ خاپۆکه •

نیّچیرڤانیّ پیر سه ر واندا
خاربوو، ئه و هه ژاند ن • لیّ
بیّچنه بوو خۆف و ترسا مرنیّ
ل دلیّ ویيه پیردا هیّلوون
کر• خانییێ ته نگ وتاری ژیّ-
رابوو مالا مه رگ و مرن و ره شیّ-
شه ڤیّ و جنه و را• ره شاتی و سرو
سه قه ما شه ڤیّ ل ده رڤه و
دیّویّ مه رگیّ ژی ل هوندوردا ، ژۆر و
د ه ر و دیواریّ مالیّ ل ناڤ
چه نگ و له کمیّ خوه دا ئاسیّ
کربوون • نیّچیرڤانیّ پیر ل بەر
خۆڤا مه رگ ومرنیّ ل ویّ د ه میّدا
کو چۆکیّد وی د له رزین و رجاف
که تبوو دلیّ وی د ه رکه ته ده رڤا •
ئه وی سروسه قەم ژمرنیّ چیّترزانی.

←

لناڤ هۆز وچڤێد جوربه جوره کوردان دا که سانێ کو شییانه چێتر ژ هه موویێ یێکاتییا ئایینی یه خویه مێژین بپارێزن و بنێشێد دینی و ئایینی یه خو ڕاگرن **ئێزد ی** یان **یه زدانی** نه •

ئه ڤ هۆز و طایفا ، ل چه ند عه شیرێد کووشکه پێك هاتنه کو ل گه له ك جی یێ کوردستانێ دا دژین • پشکا زۆره وان گوند ینه و هنده ك ژی کۆچه روره وه ندن •

پشکا زۆره ئێزد ی یان ل کوردستانا عێراقێ ئوستانا مووسلێ ناڤچا **شێخان** کو جیێ سه ڕاست بوونا حکوومەتە مێژینه ئاشووری یایه، جی وارن• هنده ك، ژی ل ڕۆژاڤایا مووسلی ناڤچا **شه نگاڕێ**( سه نجار) و هنده ك ژی ل باژارێ دیاربه کرێ کوپێشندا **ئامه د** د گۆتنێ دژین • ل باژارێ حه له بێ و ئه رمه نستانێ و ده وروبه رێ باژارێ تفلیسی ژی، هنده ك ئێزدی جی وار بوونه•

ئێزدی هه مان ئه و که سانه نه کو هنده ك ل مێژوونڤیس و لێکولا ب نه ئاگاداری ئه ڕانا ل په یره وێد یه زیدێ کورێ موعاوییه دزانن • ل راستی یێ دا ئه ڤ کوردانه چ په یوه ندی ب یه زید ێ کورێ موعاوییه ڤه چنینن • ئێزد ی یانێ **یه زدان په ره ست** • ئێزد ی پێره وێ ئایین و رێبازه که کەون و مێژینه ئیرانیێنه کو ل تێکه‌لی یا دینێد زه رد ه شتی ، مه سیحی که لیمی، مانه وی و ئیسلامێ سه راست بوویه •

**شه‌هرستانی** ل کتێبا خویه بناڤ وبانگ ( ملل ونحل) دا لبارا ئێزد ی **یاتدا** دنڤیسه: " یه زید ی - یه په یره وێ یه زیدێ کورێ ئه نیسن • ئه ڤ یه زیدا سه ر و ی باوه رێ بوو کو خودێ دێ پێغه مبه - ره کی ل ئیرانێ راکه کو خودانێ کتێبا ئاسمانی یه •

**عه باسێ غه راوی** ل کتێبا **( تاریخ الیزیدیه واصل عقید تهم )** یانێ مێژوویا ئێزد ی یا وبنێشا ئایینی یه‌وان دا دبێژیت : ئێزد ی ل راستی یێ دا بوسولمان و عه ره ب بوونه کو به ر خاترێ بهۆرینا زه مان دینێ خو ل ده ست دانه •

**ره شید یاسه می** ل کتێبا **" کورد و پیو ستگی نژاد ی ؤ تاریخی او"** دنڤیسه: " ئه وانێ کو د گه ل مێژوویا دین و ئایینا ناسیارن، دزانن دینه کی کو هنده گه ل دینێ ئیسلامێ و دیتر دینا فه رق هه یه ده بێ ره‌ه و ریشا وی ل ناڤ مێژوویێ دابه و ل نیشانێد ده ورانێ مێژین به• ئه‌گه‌ر یه زید ێ کورێ موعاوییه یان یه زیدێ کورێ ئه نیسه وییێد وه‌کی وان که یف ب وی دینی هاتنه جیهێ نه باوه ری پێ نینه، ئه مما سه ره کانییا ڤی دینی گه له کی

→

لێ ل به ر ده رێ خانی چاڤێد گورا کو چاڤ نهێری وی بوون ل تاریێ دا دچرووسین وزووره زوورا گورا هه ڤۆو فرێتێ بیروهرزێد وی پزراند• ده نگێ گوللێدنێچیرڤان تێکه لی ده نگێ گورا بوو و ل ره شاتییا شه ڤێ دا ده نگ ڤه دان• گورگێد برسی نکارین ده ست ژ نێچیرا خو بکێشن ،هێرش دانێ و ئه و ل ناڤ هه ڤدا گرتن •

چ شه ڤه ك ره ش و درێژ و سار وتار بوو• ئوسا گران دلڤیا ته دگۆت ڤه ی سپێده یێ ل دوورا ، نه یێ •به ره به ره باگه رڤه ته غر- ی وبا راوه ستا• گه لی ل بێده نگی یێ دا جووم بوو، ته دگۆت ڤه ی چ تشت نه ڤه ومییه • هێدی هێدی عه ورێد گه ور هه ڤ- به ردان ونیڤه کا عه سمانا هاته خوویان ، ئستێره ل پ- له پی ببوون و دچلڤلین ، هه وا به رب سافی بوونێ دچوو• گه لی بینا ی مرییه کی که فه ن کری چیل و که ڤه ربوو•

سبه ترا وێ شه ڤێ شڤانا هه ستکێد له شێ سێ که سا ل ده ڤ دۆرێ وێ مالێ دیتن •بەرڤا که ڤه ره دۆرا خانی ل خوونێ دا سۆر ببوو •

ل پێش دینێ ئیسلامێ دایە ٠"

هندەك ل سەر وێ بیر و باوەرێنە کو رێباز ودینێ ئێزدی و بنێشا ڤی دینی مرۆڤەکی بناڤێ شێخ عەدێ ل سەدەیێ پێنج و شەشێ کوچی دا دانایە ٠

**تیمورپاشا** ل کتێبا ( **الیزیدیە ومنشاء محلتهم**)دا دنڤیسە : " ئەڤێ طایفێ چ ناڤەك ل مێژوویی دا چ نە بوویە، بۆ جارا یێکی کوناڤێ وان ل ناڤ رووپەرێ مێژوویی دا هاتە نڤیسین سەدەیا شەشێ یە کۆچی بوو کو **شێخ عەدێ کورێ موسافر** بەر خاترا زوهد و تەقوایێ دەنگ ڤەدابوو٠ پاشی هنگێ کو شێخ عەدێ چووبوولایێ چیایێد هەکاری یێ و ل وێدەرێ دا جیوار ببوو، هەژمارەکی زۆر ل خەلکێ وێدەرێ ل وێ پەیرەوی کرن ٠ئەوی طریقەیەك بناڤێ طریقا عەدەوییە سەراست کر کو ئێزدی نهە پەیرەوێ طریقا وینە ٠

ئەمما ئەڤ گۆتنەژی سەراست نینە، چونکی یێك ل مێژوونڤیسێ سەدا شەشێ کوچی بناڤێ **" ئەبووسەعید عەبدولکەریم کورێ موحەمەد سەمعانی "** ل کتێبا **" ئەنساب"دا** دنڤیسە :

" من ل عێراقێ نێزووکاتییا چیایێ **حەلوانی** هەژمارەك زۆر یەزیدی دیتن کو یەزیدێ کورێ موعاوییە ئیمامێ خو دزانین ٠

ئەمما گورەکی کتێبێد خەطی یە، ئێزدییا و نڤیسینێد هندەك ژ مێژوونڤیسا ئێزدی ل جی مایێد دینێ مانینە کو دینێد ئیرانی یێ وەکی زەردەشتی و مەزدەکی تێکەلی رێباز و ئایینا وان بوویە ٠ هەگەرا ڤێ هندێ کو ئێزدی یا ل جی مایێ دینێ مانی دزانن ئەڤە یەکو ئەوانە دەست پێ بوونا مێژوویا خو سالا دوسەدو حەفتێ وشەشێ میلادی دزانن ٠

**"لایار"** رۆژهەلاتناسێ ناڤ وبانگ دبێژیت ئێزدی سالا دوسەد و نەهوێدێ پاش میلادی سالا دەست پێ بوونا مێژوویا خو حساب دکن، کو فەرقەك هندەك دگەل سالا ئێعدام کرنا مانی یانێ سالا دوسەدو حەفتێ و شەشێ پاش میلادی هەیە٠ هەروەتو وەك یێك بوونا عەقیدێد مەزهەبی یە وان دگەل دینێ مانەوی ڤێ هندێ راست دەردێخە ٠

هەر ئوسا رۆژهەلاتناسەکی دیتر بناڤێ **" ئێسپیرو"** دبێژە دینێ **ئێزدی** یا ل جی مایێ دینێ مانەوی یە،کو شوونەواریێد شەریعەتێد دینێ ئاشووری، زەردەشتی ، عیسەوی وئیسلامی ژی تێکەلی وی دینی بوونە ٠

" پروفیێسور مینورسکی" **ل** کتێبا **"کورد** ل بارا ئێزدی یاندا دنڤیسە : " دینێ ئێزدی یان یەزیدی سەربنێشا دەب ورەسمێد ئایینی یەگەلەك مێژین هاتییە دانان ٠"

ئەمما ئێزدی بخو سەر ڤێ باوەرێنە کوبنێشە دانەرێ دینی وان " شاهدێ کورێ جەراحێ کورێ ئادەم" بوویە٠ نهە ئێزدی پەیرەوێ شێخ شەرەفەدین ئەبولفەزایل عەدێ کورێ موسافرێ کورێ ئیسماعیلێ کورێ مەروانن، کو یێك ل مەشایخێ قەرنێ شەشێ یە کوچییە٠ ئەو ل سالا ٧٥٥ ، کوچی ل تەمەنێ نەهوێد سالی یێ دا چوویە بەر رەحمەتا خودێ ٠

عبادتگەها ناوەندییە ئێزدی یا دێرا مێژینە فە لانل **" لالەشێ"** نێزووکاتییا مووسلێ دایە٠ مەرقەدێ شێخ عەدێ هەکاری ژی ل ویدەرێ دایە ٠

بنێشا عەقیدە و رێبازا ئێزدی یان کو ل دین وئایینێد جوربەجوریێد وەکی زەردەشتی و مەسیحی ویەهوودی و ٠٠٠هاتییە وەرگرتن ، پێ بەرچاوگرتنا دو کتیبێ بنێشە ئییەوان یانێ **" جلوە"** و**" مصحف فارەش"** و پەرتووکا کو ل سالا "١٢١١"کوچی مەزنێ وێ رێبازی بو دەربارا ئۆسمانی نڤیسی یە و هەروەتۆ کتێبا کو یێك ل ئەمیرێد ئێزدی یە سەنجارێ نڤیسی یە ئەم دشێن ب ڤی جورەیی، رێبازا وی دینی رۆن بکەن :

١ـ ئێزدی یا باوەری ب هەبوونا حەفت مەلائیکەتا هەنە و دبێژن خودێ بەرێ دورەك سپی وپاشێ ژی طەیرەك، ئافراندی یە، پێش ئافراندنا عەرد و عەسمانا ذا حەفت مەلائیکە ل حەفت رۆژێ حەفتی یێ دا خولقاندی یە ٠ کو ناڤێ وان مەلاکەتانە ب ڤی جورەیی یە :

١ـ عەزازیل کوهەمان مەلەك

طاووسه و سه روکێ حه موو مه لاکه تایه ٠

٢- دوردائیل

٣- ئیسرافیل

٤- میکائیل

٥- جه برائیل

٦- شه منائیل

٧- نوورائیل

٢- ئێزدی به ره واژی دیتر دینا قه دره کی زۆر بو مه له ك طاووس، دگرن وئه وی نابه ینجی یێ خودێ و ئافراندنا دونیایێ دزانن. هنده‌ك خاسییه تاژی تایبه ت ددنه وی کو دگه ل خاسییه تێ شه یتان، یێکن به رڤێ هندێ ژی دبێژنه وان شه یتانپه ره ست ٠ ئێزدی شه یتان به ر خاترا دژایه تی یا وی دگه ل خودێ ناپه رێزن. به لکوو مه له ك طاووس یان شه یتان مه لائیکه ته کی دزانن کو به ر خاترا جی نه ئینانا ئه مرێد خودێ که ته به ر غه زه بێ و چۆ جه هنه مێ. ئه و حه فت هه زار سالا گریا و حه فت کووپ ل رۆندکێ وی ته ژی بوون کو پاش هنگێ خودێ ئه و به خشی و لێ بهۆری ٠ به رڤێ هندێ ئێزدی یا باوری ب هه میشه تی یا عه زابێ چنینن.

٣- ئێزدی شێخ عه دێ کورێ موسا- فر مرۆڤه کی مه زن دزانن و گه له ك که رامه ت و موعجیزا نسبه ت دده نه وی و مه رقه دێ وی بو خو کرنه زیارتگه ه وئۆجا غ و دبێژن ئێزدی ده بێ هنده‌ك ل ئاخا مه زارێ وی لال، خو راگرن ٠

ئێزدی یا عه بده ك بناڤی عه یدا شێخ عه دێ یان عه یدا که بیر هه نه کو ل رۆژا وێ عه یدێ دا دچنه سه ر مه رقه دێ شێخ عه دێ و سێ رۆژا رۆژی دبن وهه رئوسا ل عه یدا قوربانێ دا سه ر مه زارێ وی حازر دبن داکوو گونه هێ وان ببێنه به خشین ٠

٤- هه ر ئێزدی یه ك دبیت چاخێ هه لاتنا رۆژێ به را خو بده رۆژهه لاتێ ورۆژی بپارێزه و دوعایا بکه ٠

٥- دگه ل " اعوذبا ٠٠٠٠٠ من الشیطان الرجیم" نه یارن ٠

٦- طه لاق دانا ژنا هه ره مك ※ دوروسته، ئه مما طه لاق دانا ژنا خودان زارۆك باش نزانن ٠ ئه گه ر مێره ك ساله کی بچه سه فه رێ ژنا وی لێ حه رام دبه ٠

٧- هنده ك تشتێ خارنێ حه رام دزانن بێد وه کی: ماسی کوندك و که له م.

٨- باوریيه ك زۆر ب حوسێنێ کورێ مه نسوورێ حه لاج و شێخ عه بدولقادرێ گیلانی و حه سه نێ به سری هه نه ٠

٩- رێڤه به رێد مه زهه بییه ئێزدی یان حه فت طه به قه و ده سته نه کو دگه ل طه به قه و ده سته یا عه وام دبنه هه شت طه به قان، چ که سی حه قێ ده رکه تن ل طه به قا خو چنینه ٠ ئه و هه شت طه به قه ئه ڤه نه :

١- ئه میرێ شێخان ٢- بابا شێخ ٣- شێخ ٤- پیر ٥- فه قیر ٦- خه به ربێژ وده نگ بێژ ٧- کۆچه ك ٨- مورید( طه به قا عه وام )

٩- ئێزدی هه ررۆژی شه ش جارا نڤێژێ دکه ن. گاڤا نڤێژکرنێ به رێ خو دده نه رۆژهه لاتێ، ئه وانا سه ر وێ باوری یێ نه کو رۆناهییا دونیایێ هه موو ل رۆژێ یه و رۆژ ژی کێمه ك ل رۆناهی یا خودایه ٠

ئێزدی پاش نڤێژێ دوعایه- کی دکه ن کو دبێژنێ نزای پاش نڤێژ گه له ك عه یدو جه شنێد ئێزدی یا هه نه، دینێ وان غه م و تالیيێ نه باش دزانه. به رڤێ هندێ ئێزدی هه مێشه که یف خۆشن و خو ل غه م و تالییا دپارێزن ٠

مه زنترین عه یدا ئێزدی یا عه یدا نه ورۆزێ یه. ئێزدی یا هنده ك عه یدێ دی ژی هه نه کو ئه ڤه نه :

١- عه یدا چارچارێ هاڤینێ ٢- عه یدا جه ماعییه ٣- عه یدا قه باغ ٤- عه یدا سه فه را چل مێره ٥- عه یدا ئێزدییه ٦- عه یدا بلنده ٧- عه یدا عیێجوه ٨- عه یدا مێهرگان ٩- عه یدا چارچمارێ زڤستانێ ٠

ب گۆتنا دوکتور قه ناتێ کوردو ئێزدی خودانێ چه ند جلد کتێب و ره سالانه کو حه موو پێ خه طێ ئێزدیکی هاتنه نڤیسین، ئه مما دو کتێبێ وان کو ل حه موو- یاب ناڤ وبانگترن " جلوه" و " مسحه فاره ش"ه ٠

کتێبا "جلوه" ب زاراڤێ کورمانجی یا ژێرین، "مسحه فاره ش ژی ب زاراڤێ کورمانجی یا ژۆرین هاتنه نڤیسین ٠

# سوورێژه

سوورێژه نەخۆشی یەکی وەگیر وچلکنی "ڤیرووسی"یە کە بەتایبەت لە کاتی مندالّی دا دەبیندرێ . لەم نەخۆشی یەدا پێستی لەشی نەخۆش ، زیپکە دەردەکا . یانی نیشانەی پێستی لەو نەخۆشی یەدا زۆرتربەرچاوە و سەرەنجی دەدرێتێ ، بۆ ناسینی ئەو نەخۆشی یە. هەموو کەس دەتوانێ ئەو نەخۆشی یە بگرێتەوە . بۆ ئەوەی کەسێک تووشی نەبێ دەبێ بکوترێ یانی دژی ڤیرووسی سوورێژە واکسێنە بکرێ .

نیشانەی سوورێژە لەنێو مندالّەگەورەکاندا توندترە ومەترسی لایەنەخراپەکانیشی زۆرترە .

**گرتنەوەی سوورێژە :**

## گرتنەوە..

سەرچاوەی ئەونەخۆشی یە تەنیا ئینسانە . گرتنەوەی ئەو نەخۆشی یە بە شێوەی راستەوخۆیە و لە رێگای ئەو دلۆپانەی کە لە دەم و کەپۆوە لەگەلّ چلّم وبەلّغەم وتف دێنەدەر ،پەرەدەستێنێ.

گرتنەوەی ناراستەوخۆ بەهۆی ئەوە کە ڤیرووسی سوورێژە لەبەرانبەر هەوای ویشکی دەرەوە وگەرماوشتی وادا خۆڕاگر نیە زۆرکەمە .

مردن بە هۆی ئەو نەخۆشی یە لە نێو ئەو کەسانە کە دەیگرنەوە ٥ تا ١٠ لە سەتدا (١٠ – ٥ %) دیتراوە .

**نیشانەی سوورێژە :**

## نیشانە..

گرینگترین نیشانەی سوورێژە کە ١٠ رۆژ دوای گرتنەوەی ئەو نەخۆشی یە دەبیندرێ بریتین لە :

تێ – هەلّموسان و با کردنی پێستی ژوورەوە(مولتەهیمە)ی چاو ، ئاوەچۆڕەی گەروو و کەپۆ– ماندوویی، پەیدابوونی زیپکەی ورد ، ورد وسپی رەنگ لە دیوی ژوورەوەی روومەت و.... کە ٣ تا ٤ رۆژ دوای بینینی ئەو نیشانانە ، زیپکەی سوور ،سوور ، لە پێستی لەش دا بەدی دێ کە لە روومەت و دەموچاوەوە دەست پێ دەکا و هێدی هێدی تەواوی پێستی لەش دادەگرێ دوای ٤ تا ٥ رۆژ ئەو زیپکانە لەنێو دەچن .

**پێشگیری لە سوورێژە :**

١– باشترین رێگای بەرگری لەسوورێژە کوتان (واکسینەکردن)ی مندالآنە کە لە واکسەنی زیندووی زەبوون کراو کەلک وەردەگیرێ .لەمەملەکەتی ئێمە (ئێران)دا ئەوواکسەنە جارێک بەر لە مانگی پانزدەهەمی تەمەنی مندالّی دا ( لەتەمەنی ٦ تا ١٢ مانگی) دەکوترێ ونۆبەی دووهەمیش لە ١٥ مانگی دا دەکوترێ .

بەدوای کوتانی واکسەنی سوورێژە ،لەنێوان ٣٠– ٥ لە

سەتی منداڵەکاندا نیشانەی ئەو نەخۆشی یە زۆر بە وردی دەبیندرێ .

ئەوکەسەی کەدژی سوورێژە دەکوترێ یا ئەو کەسەی جارێک تووشی ئەونەخۆشی یە بووە وچاک بووەتەوە ،ئیتر هیچ کات تووشی ئەونەخۆشی-یە نابێ ودژی میکرۆبی بە قووەتی ئەو پەتایەش بە باشی خۆڕادەگرێ .

**تێبینی :**

## تێبینی

ژنانی زگ پڕ (حامیلە) و ئەو کەسانەی کە نەخۆشی (بەدخیم"ی وەک سەرەتان و دیابێت (نەخۆشی قەند) و سیل یان هەیە و یا ئەو کەسانەی کە لە دەوای " کۆرتیکۆسترۆئید"ی کەلک وەردەگرن ،نابێ بکوترێن .

جاروبارەش بۆ بەرگری لە بەدی هاتنی عەواریزی واکسەنی سوورێژە ، ئەو واکسەنە لەگەڵ"گاماگلۆبۆ-لین" پێکەوە لێدەدرێ کە کارێکی باش نیە وزۆر زوو واکسەنەکە بێ کەلک دەکا و دەبێ دوای ٢ تا ٣ مانگی دیکە دیسان واکسەن لێ بدرێتەوە .

جگەلە" واکسیناسیۆن" کە باشترین ڕێگەی پێشگیری یە ،لەوڕێگایانەی ژێرەوەش کەڵک وەردەگیرێ :

٢- هەڵاواردنی ئەو کەسانەی کە نەخۆشن و چارە سەرکردنیان .

٣- خاوێن کردنەوەی (ضد عفونی) ئاوەچۆڕە و لیکی دەموکەپۆی نەخۆشەکان وئەو شتانەی کە بە ئەوان ئالوودە و پیس بوون .

٤- لێکۆڵینەوە لەوەکە خەڵکی دیکەش گرتویانەتەوە یان نا؟ بۆ بەرگری لە بڵاو بوونەوەی نەخۆشی یەکە .

٥- نیشان دانی ڕێگای بڵاوبوونەوە و گرتنەوەی ئەو پەتایە بەخەڵک و فێر کردنی پاک و خاوێنی بە ئەوان .

٦- تێگەیاندنی بەر پرسانی بێهداری بۆ ئەوەی فێکرورایەک بۆ بەرگری لە بڵاوبوونەوەی پەتاکە بکەنەوە .

**چارە :**

سوورێژە نەخۆشی یەکی ویرووسی یە وهەر بۆیەش دەرمانی تایبەتی نیە . بەڵام بۆئەوەی لەپێک هاتنی عەواریزەکەی بەرگری بکرێ لە دەوای " دژ میکرۆب " ( ئانتی بیۆتیک)وتەقویەتی کەڵک وەردەگیرێ و بۆ باشتربوونی نەخۆشەکە و بەرگری لە خراپتربوونی حاڵی نەخۆشەکەوپەرەساندنی میکرۆب لەلەشی دا ، هەوڵ دەدرێ . بۆ نموونە :

هەتا ئەو کاتەی کە نەخۆش زیپکەی هەیە دەبێ لەسەرماوشتی وەها بپارێزرێ و لە جێگادا درێژ بێ ولە بەرئەوەی کەخۆرنارەحەتیان دەکا باشترە کە نووری بەرەنگار دانەندرێ و جێگاکەی ئارام و کەم نوور بێ. ئەگەریش کۆخەکەی توند بوو دەکرێ لە شەربەتی دژی کۆخە کەلک وەربگیرێ . چونکە ئەو کەسانەی کە گیرۆدەی ئەوپەتایە دەبن لەبەرانبەر نەخۆشی یەکانی دیکەدا خۆڕاگری یان زۆر کەم دەبێتەوە ولەوانەیەکە میکرۆبی دیکەش بەسەری دا ،

زاڵ بن ، واباشە کە لە دەوای دژی میکرۆب وەکوو : سولفادیازین وپنی سیلین هەتا ٥ - ٤ ڕۆژ کەڵک وەربگیرێ .

بە سفووت گەیانـــــدن
سوور کردنەوە ، ســەلماندن
( ثبوت ) ، سابیت کردن
**دیاردە** :فنۆمـن ،پدیدە
**دیاگرام** :نموودار ،تەرح
**ریتم** :ئاهەنگ
**وەگر** : واگیر ، نەخۆشیەک کـە
خەڵکی دیکـــەش زوو
دەیـگرنەوە .
**پەتا** :نەخۆشی ، ئافەت
**بەرەنگار** :رووبەروو
**تافگە** : ئاوهەڵدێر
**بارست** : ئەندازە
**قوشقی بوون** :سڵ بوون
**تەنەوە کردن** :بڵاوبوونەوە
**جووت بوون** :جفت گیری
**کەوی** :رام، دەستە مۆ
**ئەسپەردە کردن**:ئەسپاردن
**بە ئێروو** :دەوڵەمەند
**بەربینگ** :قوڕ قوڕۆچکە
**بەربینگ پێ گرتن**:یەخەگرتن
**ئەوک** :گەروو ، بەربین
**مژی ( مەژی – مێژی)** :مێشک
فکروهۆش
**رندۆڵ** :تیتاڵ، شـڕ
**ئامێر** :ئامراز ،ماشێن
**بۆتکە** :دەکە و دووکانـــی
چکۆلەی سەر شەقام .
**گازندە** :شکایەت ،گلەیی
**بەرکۆژە** :منە ومــوو و روی
ئەستۆ یادەستـــــی
منداڵ .
**بـــەرکوژەی دڵم** :خۆشەویستـم،
ئازیزم
**بۆژە** : بۆگە ، بۆگەن.بەتفاق و
لەوە ڕێک دەڵێن کە پێشێــــل
کراوە و ماڵات نای خوا .

**سفت و سۆ** :سووز و گـــوداز،
دڵتەزێن،بەسۆزوجەرگ بر
**لە نێوەوە چوو (دەنێوەوەچوو )**:
کەسێک کە تەمەنی لاوەتـــی
تێپەڕیوە و بەرەوپیری دەچێ
**لێزمە** : رێژنەی بارانی بەخور
**بە لێزمە** :پەیتا پەیتـــا ،
بە دووی یـەکدا
**گراوی** :خۆشەویست، ماشقە، یار
**بەلووزەو** :بە غوڕەم ،بەلێشاو
**هەتوان** :مەڵحەم و دەرمان
**سوکنایی** :ئاراوقارا ، ئارامی
دڵ و دەروون
**زایەڵە** : دەنگدانەوە
**رەهەند** : کانال ،قولکە (نقب)
**پێناس** : شوناسنامە ،کارتـــی
ناسیاری
**گەرۆک** :دنیاگەڕ ، گـەڕیـــدە
( سیاح )
**سانێ**:ئاسایی،عادی، ئاسان
**بەوەج**:بایەخدار ،گرینگ
**بنەما** : ریشە وئەساس
**بەلەزوبەز**: پڕ جووڵــە و
بەتەوژم و تین
**ملانێ**: زۆرەوانی ،کوشتی
**هلستە** : (هەستا ،را بــــوو
هەلستا )

**فێهرس** : مێرخاس ،پەهلـەوان
**دۆژ** :دۆژەهـ ، جـەهـەننـەم
دۆزەخ
**رەوال** :جەوان ،لاو ، گەنج
**زەنگوو** : زەنگی ، رکێـــف
ئاوزەنگی
**فرتۆنە** : تووفان ، تۆفان
**عیار** :عیار ،پێست ،خیگە
**تەلتە** :گولتە ، گەوال .بەلەهەور
**پۆخسیدە** :رووترش ،تاڵ وترش
**بەڕیدە** : ئاوارە
**رێچ** :شۆپ ، جێ پێ
**بەزر** :بەرزە ،ئوندا ،ون،گوم ،بزر
**کم** :کەپ ، لووت
**کوندکی** :قەرەفیسکـــــا ،
هەڵترووشکان
**ڤێخست** :داگیرساند
**شپێ** :سەرپێ
**هەمانێ** :بزۆرێ،بەزەحمەت
**گرک** :تۆپک ، تەپۆڵکە
**شەوات** : سۆز، سۆژ
**قوڕانە** :لۆلایی دەرگەی دارین
**ئاڕووک** : میچ ، بەربان
**خوڕی** :خالیس ، ناب
**کەرمە** :کەمرە
**ئێزنگ** :قرشک ،ئاوردوو
**زێج** : بافووناڵخالس ،تەنەکەی
ئەستـــوور
**کارتۆ** : بەیاث
**بێنهتن** :قەڕسین،سەهـــۆڵ
بەستــن
**هەلک** :هەناسە
**قەپەر چەکرن** :قەرپەچەکرن ،
توندلە باوەش گرتن
**هەرەمک** :ئەرەمک، نەزۆک
**ئیلاقە** : بوختان
**لاڤایی** :پاڕانەوە ،پاڕیان

تەرخان ئاوا

دیاری: بەختیار میعماری

تینوو

دیاری: خالید ئیسماعیلی - مەهاباد

گەلاتی نادری

دیاری: کەلیموللە تەوەحودی - مەشهەد

فرمێسک

دیاری: بازید مورادی - پیرانشار

پیرەدار

دیاری: خالید قەلعە کووهی - بۆکان

قەلای خوشەب: لە نێوان شاری وان وباجکالای کوردستانی تورکیا.

دیاری: ناجی بانی